# دیوانی بەختیار زێوەر








مەحموود زێوەر

کۆی کردووەتەوە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە

چاپی سێیەم

ناوی کتێب: دیوانی بەختیار زێوەر
ئامادەکردنی: مەحموود زێوەر
بلاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٧٥٥
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی سێیەم، هەولێر ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٥٨٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# چەند وتەیەک

دیوانی بەختیار زێوەر دەبوایە بەر لە ئێستە و زووتر دەست خوێندەواران بکەوتایە و لەبەر چەند هۆیەک دواکەوت، بۆ ئەمەش داوای لێبووردن لە خوێنەری بەڕێز دەکەین.

دیوانە دەستنووسەکەی خۆی کە بەخەتی خۆی ئامادەی کردبوو و ڕێکی خستبوو. لەسەر داوای بەڕێز مامۆستا ئەحمەد هەردیی شاعیر کەوتە لای ئەو، بۆ دیراسەت کردنی جۆرە ئەوزانێکی شیعری کە تا ئەو سەردەمە هیچ یەکێک لە شاعیرانی بەر لە بەختیار زێوەر بەو جۆرە شیعریان دانەنابوو، تەنیا ئەم نەبێ بۆ بەڵگە و نووسین لەسەری دیوانە دەستنووسەکەی لا مایەوە: مامۆستا هەردی بەسەریدا چووە دەرێ، دیوانەکە کەس نەیزانی کوێ کەوت، بەڵام من کاتی خۆی نوسخەیەکم لەبەر ئەو دیوانە دەستنووسەی خۆی نووسیبووەوە لای خۆم پارێزگاریم کردبوو کە ئەمەیە وا لەبەر دەستاندا، کاتێک گەرایەوە و داوای دەستنووسەکەم لێ کرد وتی بەیەکێکدا بۆم نادرووێتەوە، بەڵام نایەتە خەیاڵم کە کێ بێ، بەهەرحاڵ دیوانە دەستنووسەکەی بەختیار زێوەر لەم هاتوچۆیەدا فەوتا، ئیتر نازانم کێ دەستی پیاگرتووە و لای خۆی شاردوویەتییەوە. چەند جوان دەبوو ئێستە بۆ بەڵگە و نموونە چەند دەستخەتێکی خۆیمان بکردایە بەدیاری، هەر کەسێ ئەو دەستنووسە بکاتە سەرچاوە و نەیگێڕێتەوە، بۆ ئێمە بەرپرسیارە لە بەرامبەر دادگادا.

لەسەر بەختیار زێوەر زۆر کەم نووسراوە، چ لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا چ بەڵێدوان لەسەری. جگە لەو دیراسەتەی کە پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ نووسیوێتی و دووجار بڵاوی کردووەتەوە، جارێک لە گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا ژمارە ٢٢ ساڵی ١٩٧٨ چاپخانەی (دار الجاحظ) لاپەڕە ٣٧ بە ٦٨ لاپەڕە و جارێکی تریش لە کتێبی (شیعری کوردی، بەرهەمی شاعیران) بەشی یەکەم (فەقێ تەیران، عەلی بەردەشانی، بەختیار زێوەر) چاپخانەی «الحوادث» بەغدا ساڵی ١٩٨٠ لاپەڕە ٧٩-١٢٣ گرتووەتەوە، جارێکی تریش مامۆستا کاکەی فەللاح لە کتێبی

(کاروانی شیعری نوێی کوردی)دا کە یەکێک بوو لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی یەکەم لە بەغدا چاپخانەی کۆڕ ساڵی ١٩٧٨ لە لاپەڕە ٧٧-٩٦، ئەمانە و جگە لە چەند وتارێک کە لە گۆڤاری بەیان و ڕۆژنامەی ژیندا هەردوو نووسەر لەسەریان نووسیوە.

بەختیار جگە لە شیعر دەستی وەرگێڕان و چیرۆک نووسینیشی هەبووە، لەگەڵ فایق بێکەسدا بەجووتە وتارێکی جەمالەددینی ئەفغانییان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی لە ژێر ناوی (شەرەف)دا و لە گۆڤاری گەلاوێژدا بڵاویان کردووەتەوە. هەروەها چیرۆکی (شەوێک لەسەر لوتکەی ئەڤەرست)ی نووسیوە و بەزنجیرە لە گۆڤاریا دەنگی گێتی تازادا بڵاوی کردووەتەوە لە ژمارەکانی ٢-٧ بەرگی ٥ ساڵی ١٩٤٥ کە هەردوو ئەم بەرهەمانە لەم دیوانە بەرچاو دەکەون.

**ژیانی**: ناوی ڕاستەقینەی (فایق)ە کوڕی شاعیری بەناوبانگی کورد (زێوەر) ئەفەندییە. لە ساڵی ١٩٠٨دا وەک خۆی لەم دیوانەدا نووسیویەتی لە شاری سلێمانی لەدایک بووە. سەرەتا وەک هەموو منالانی ئەو سەردەمە لە حوجرە خوێندوویێتی و پاشان چووەتە قوتابخانە و پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواو کردووە و لە بەغدا دەورەیەکی (موزەمید بەیتەری) دیوە و دوایی چووەتە سەرکار بەفەرمانبەر لەناوچەکانی سلێمانی، باش گەڕاوە و ماوەیەکیش لە پردێ بووە. ساڵی ١٩٤٦ کاتێ قوتابخانەی ناوەندی شەو لە سلێمانی کرایەوە یەکێک بووە لە قوتابییەکانی، بێ گوێدانە تەمەن و ئەرکی ژیان و پلەی کۆمەڵایەتی و شاعیرانە، بووە بەقوتابی و ساڵی ١٩٤٨ پۆلی سێیەمی ناوەندی تەواو کردووە.

هەر لەو ساڵەدا و بەهۆی کۆچی باوکییەوە، تەواو بەدەست نەخۆشییەکەیەوە کە زووتر سەرەتای دیار بوو، پەرێشان و سەرگەردان بووبوو. لە بەغدا عەمەلیاتی مێشکیان بۆ کرد و کاسەی سەریان هەڵدایەوە، پاش ئەو عەمەلیاتە بەشەش مانگ ڕۆژی ١٩٥٢/١٢/٣١ کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی (گردی جوگا) لە سلێمانی لە تەنیشت باوکییەوە، نێژرا ئەوەشمان بیرنەچێ کە هەر لە منالییەوە لە بەهرەی ڕووناکیی چاوێکی بێ بەش بوو، بەر لە مردنی بەدوو ساڵ ژیانی هاوسەری پێک هێنا و هیچ منالێکی نەبوو لە پاشی بەجێ بمێنێ.

له کۆڕی تێکۆشانی نیشتمانی و پەیوەندی لەگەڵ بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردەواریشدا لە هاوەڵانی خۆی دوانەکەوتووە هەمیشە لەگەڵ ئەو دەستە و کۆمەڵە و ڕێکخراوانەدا کە لەپێناوی مەسەلەی کوردا تێ کۆشاون جۆرە پەیوەندییەکی بووە و لێیان دوور نەبووە.

لە ساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨دا پەیوەندیی لەگەڵ پێشکەوتنخوازانی عێراقدا هەبووە لەو کۆڕ و شانانەدا بەشدار بووە کە ئەوان لە شاری سلێمانی بۆ ڕۆشنبیران و لێکدانەوەی بیریان ڕێکیان خستووە. فەرموون ئێوە و کاروانی ژیانی شیعری بەختیار زێوەر.

مەحمود زێوەر - سلێمانی

# له عەشقی حوسنی

١٩٢٥

له عـەشـقی حـوسنی خـەتوخـاڵی نێـرگسـی شـەهلات
ئەسـیـره چەن دڵی زاری فـەقـیـر و چەن شــەهلات
خـەیاڵی خـامـه ئەگـەر بێـتـه وەسـفی تۆ خـامـە
هـەزار هـەزاری زوبان شێـتـه بێـتـه نەغـمـه سـەرات
چ دڵبــەرێکی عــەجــەب دڵبــەرێکی ئەی جــانـا
لـه نازی دیدەیی بـازت دڵان ئەبێـــتـــه فــیـــدات
ئەگەرچی ئێسته هەڵات ڕۆژ له کەل بەعیشوە، بەڵام
کـه حـوسنی تەلعـەتی تۆی دی خـەجـاڵەتانه هەڵات
مـەڵێن له ضـەربەیی غەمزەی چ کـەس بەرین له برین
نـیــشــانـی زامی دیاره له پـیــر و جــوانی وڵات

## دڵم

١٩٢٥

دڵم ئەسـیـری کـەمـەندی یەکـێکە بێ ئاین
بەتیری غەمزەیی خونکاری جەرگی کردە برین
بەخـەندەیی لەبی ئاڵی ئەسـیـری کرد گـیانم
بەچیـهـرەیی وەکـو ڕۆژی بووە بە ڕۆژی زەمین
فـیـدایی خـاکی قـەدەمـتم دە زوو بکە چارەم
نەمـاوە تاقـەت و هۆشم لە تاوی شین و گـرین
منم کـە بەندەی دەرگـاو مـوخلیست قـوربان
لە دەرحـەقی منی مـیسکینٛ مـەکە بەیانی کین
بلێ بەشـیری برۆت بسێنـە با نەڕێژێ خـوێن
نەماوە موسلیم و کافر، ئەجارێ گشـتی برین
ئەگەرچی فەرز نییە (ئامین)، بەڵام لە عەشقی تۆ
لەباتی جـارێ هەزار جـار بەدڵ ئەڵێم: ئامین
لە (فـایق)ی مـەگرە مـەسـتی خوردە سـاڵێکم
باڵای مـەبینە، ئەویش تیـفلی عـەشـقـە نازەنین[١]

---

(١) ئەم وشەی (نازەنین)ە نیوەبەیتەکە لەنگ ئەکا، بۆیە درێژەدانی بەبڕگەی (زە)کەی پێویستە -م.



## بۆ شەوقە قەمەر

١٩٢٨

بۆ شـەوقـە قـەمـەر وەختێ کە هەڵدێ لە هـیلالا
مـۆمـێکە لە چاو حـوسنی ڕوخـی دلبـەری والا
شـێـتـی لەبی تۆم، وێڵـم و مـەجنوونـی بیـابان
پەروانەیە دڵ، وێڵـــە بەدووی دیدەیی کـــالاّ
عەیشم هەموو غەم، بێ خەو و خۆراکە وجوودم
تۆش کـافری ڕەحـمت نییـە یەک ئان لە خـەیالاّ
مـردن بەشـی گـەورەی منە لەم ڕێگەیـە قـوربان
ڕەحـــمێ بکە تۆش بمخـــەرە دەر لەم بنی چالاّ
لەم ڕێگەیی پڕ تاب و غـەمـــە (فـــایق)ی زێوەر
سووتانە بەشی، مردنە حیصـصـەی لەمـە ئالاّ

## موتریبا

١٩٢٦

موتریبا بێنە پێشێ عوود و تار
خاڵییە مەجلیسم لە گشت ئەغیار
دەسی پێ کە بەحەنجەرەی داوود
تا لە دڵدا نەمێنێ هیچ ئازار
با هەموو کەس بزانێ بێ خەفەتین
چاوی دوشمن ببێتەوە شەوی تار
کۆمەڵێکین بەری لە گشت هەم و غەم
مەستی بادەی دەسی شەریفی یار
گەرچی زستانە بەفر ئەبارێ، وا
وەختی بەزمە بەچەشنی فەسڵی بەهار
غەمی هیچم نییە لە دونیادا
غەیری یادی ڕۆخ و لەبی دڵدار
موتریبا خۆش بڵێ بەنەغمەتەوە
(لیس فی الدار غیره دیار)

## بۆ لاوانی کورد

ڕۆژنامەی ژیان ساڵی ٣، ژمارە ١١١
٢٦ی نیسانی ١٩٢٨

زینەتی دیوانی کوردە، هیممەتی لاوانی کورد
لائیقە ئەلحەق کە بێتە مەفخرە و عینوانی کورد
حەمدولیلا نەجم و ئیقبال و سەعادەت تالیعە
وا منەوەر بوو بەجارێ زولمەتی دەورانی کورد
بارەکەڵلا ئەی وەتەن پەروەر کە سەعی و غیرەتت
بویتە نووری قەلب و بینایی هەموو چاوانی کورد
کەس نەڵێ ئەمڕۆ وەتەن وێرانی دەستی زیللەتە
دەم بە دەم زاهیر ئەبێ مەعموورەیی عیرفانی کورد
چارەیی دەردی جەهالەت، عیلمە، ئێوەش لاوەکان
عیسایی موعجیزە شیعارن بۆ بڵندیی شەئنی کورد
لەکە نەکەیت لە کورد، تا ئێوە هەن دەرناکەوێ
پاک و بێ عەیبە دامانی کورد تا مانی کورد
سا بە دڵ هیممەت بکەن بۆ نەشری عیلم و مەعریفەت
تا موبەدەل کەن بە ڕووناکی شەبی هیجرانی کورد
تەیری هیممەت بێ تەئەمول سەر لە علوییەت ئەدا
هائیلی پەروازە بۆ کەیوانەیی کێوانی کورد
هاتفی عەرسەی بەلاغەت وا بەدەنگی بەرز ئەڵێ
زینەتی دیوانی کوردە، هیممەتی لاوانی کورد

## مەڕ

من مەڕم زۆر خۆش ئەوێ بەدڵ و بەگیان
شیرەکەی گوانی ئەدۆشین پاک و جوان
ماست و ماستاو و کەرە و کەشک و فرۆی
لێ ئەکەین، ئەیخۆین پەنیر و مەشکە دۆی
خورییەکەی ئەبڕین و ئەیشۆین پاک هەمووی
بۆم ئەڕێسن کیژ و ژن تاو تاوی مووی
پاش ئەمە ئەیبەم لە بۆ جۆلایی شار
تار و پۆی بچنێ بەئیشی وردە کار
ئەیچنێ لێی بۆ جلوبەرگی کوڕان
شاڵ و چۆغە و ڕانکی نایاب و جوان
ساڵێ بەرخێکمان بەدیاری پێ ئەدا
گۆشت و قاورمەی ئەخۆین و بێ سەدا
ئەم هەموو نەفعەی هەیە ئەی کاکە گیان!
بۆیە زۆرم خۆش ئەوێ بەدڵ و بەگیان

# گفتوگۆ لەگەڵ شاخی سوورکێو

سلێمانی ١/١٠/١٩٢٨

کەژی سوورکێو لەبەرچی لووتی خۆت بەرز کردووە لێمان؟
سـەرت ڕووت کـردووە وەخـتـە بگەیتـە مـەرتەبەی کـەیوان
دڕندەی سـەرزەمـینت بۆ چ حـەشـارداوە لەناو خـۆتا
لە خۆت گرد کردووە هەرچی کە بوومتە دوژمنی ئینسان
بەهارانیش هـەرمس دێنی بەسـەر ڕێبـواری کـوردانا
بەزسـتانیش بەسـەرماکەت ئەخـەیتـە کاروان گـریان
لەبـەرچی بوویتـە کـانگای جـەردە و دز (دائم الاوقـات)
حـەیاتی قەومی کوردت خـستوومتە تەهلوکە و گـیاندان
ئەوەند مـەغروور مـەبە، دەعیە و تەکەببور هێندە مەنوێنە
لە شـاخی (ئەلپ) و(ڕۆشـۆز) فەزڵی تۆ زیاتر نییە قوربان
زەمـانێ دێ لەشت کون کون ئەکەن بۆ ڕێی شـەمەندۆفـەر
ئەبیـتـە ڕێگەیی مـۆتـۆڕ و ڕێبـازی هـەمـوو کـوردان
قـەدت قـەدبڕ ئەکەن بۆ ئەبنییەی زۆر خۆشی وەک ئۆتێل
سەرت چاک تەخت ئەکەن بۆ جێگەیی گوڵزار و باغستان
دڕندە و وەحـشـیـانت پێـسـتی ئەگـروون بۆ لەبەرکـردن
دز و جەردەت هەموویان ئەبنە چایچی و خانچیی کاروان
بەڵام ئەوسـا ئەبیتـە مـەنبـەعی کەیف و سـروری خـەلق
ئەبیـتـە جـەننەتێکی بێ مـیسـالی ئەهلی کوردسـتـان
لە چوار ئەترافـەوە عـالەم بەدەسـتـە دێنە سـەیرانت
ئەچیـتـە ڕیزی شـاخی ئەورووپا و کـێـوەکـەی لوبنان
ئەوا من پێم وتی: تۆ قـەت لە یادت دەرنەچێ سـوورکـێـو
لە فـەسلی ئاتیـیا ئەم موشکیـلاتە حـەل ئەبێ ئاسـان

## جوابی سوورکێو[1]

وەکیلی ڕاستی سوورکێو: عەلی عارف ئاغا

نیشانەی شەئنی کوردە ڕەفعەت و بەرزیم بە سەد عینوان
کە سەربەرزی ئەکەم حەتتا لەگەڵ ئەیوانەکەی کەیوان
سروشکی عەشق و مەیلی میللەتە سەیلی بەهارانم
ئەڕێژم دەم بەدەم عالەم ئەبێتە زەلزەلە و تۆفان
دڕندەی جەهلە بیللا جەرگی کوردی کردووە لەت لەت
ئەنیسی قەلبی من بۆ حاڵی ئێوە جۆششە و گریان
بەلەعلی تێ ئەگەن وەقتی سەحەر بەرق و بریقەی بەفر
بەیادی سیرعەتی فەوجی فەلەک نازل ئەبن بۆیان
لە سەد (ڕۆشۆز) و (ئەلپ) و(پیرەنە) فازلترم تەحقیق
بەتەرفیعی قەدیمی جەددی ئێوە بووم بەشاهیدتان
کە قەومی کورد گەیشتە وەزع و جاە و ڕەفعەتێکی تام
لەت و کون کەن لەشم، حەللی بکەن ئامال و موشکیلتان
مەقامی غیرەتە بۆ من کە بشکێنن هەموو ئەعزام
موزەییەن کەن هەموو جەستەم بەئۆتێل و بەباغستان
لە پێناوی تەرەققیدا بخنکێنن بەسەد نیللەت
دز و جەردە و دڕندە و وەحشیانم دوون و ئەعلایان
خوا سا تاجی ئەم جاهەم لەسەر نێی تا لە عالەمدا
بەسەتوەت بەڵکە بچمە ڕیزی شاخی پیرەنە و لوبنان
هەتا عالەم بە سەد حیرەت کە عوشرەتگاهی من بینن
لە هەر لاوە بکەن ئیحزاری تەجهیزات لە بۆ سەیران
لە حاڵی حازرا جەهدێ بکەن جەردەی جەهل دەرکەن
هەتا بۆ نەسلی ئاتی حەل بکەن ئامال و موشکیلتان

---

(١) ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ١١٧ی ١٤ی حوزەیرانی ١٩٢٨

## چەند شیرینە لام

گۆرانی لەسەر وەزنی مارشی خدێوی

چەند شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم
بەفیدای ئەکەم سەر و گیان و بەدەنم
خاکی وەتەنم گشتی زیو و زەڕە
بەردی وەک گەوهەرە، ئاوی چەشنی کەوسەرە
فەرزە بۆ وەتەنمان جان فیدا کردن
لە ڕێی ئەم خاکەدا بەکۆمەڵ مردن
دەسا کوردینە بەسیە ئەم حاڵەتە
بۆ تەرەققیی قەومی کورد، ئەمڕۆ ڕۆژی هیممەتە

## گۆرانیی براینه له خەو هەستن

لەسەر وەزنی (بني وطني)

براینە! لە خەو هەستن، بەیانە
زەمانی هەوڵ و علیم و حوورِ ژیانە
هەموو قەومێ بەدائیم تێ ئەکۆشن
لە ڕێگەی عیلم و فەندا دڵ بەجۆشن
ئەرێ کوردی فەقیر و بێکەس و غەم
هەتاکەی زەهرەی نادانی ئەنۆشن
براینە...
وەتەن پڕ لەشکری جەهلە ڕەفیقان!
دەری کەین با بە هۆردووی عیلم و عیرفان
براینە...
بە یەکدڵ با لەبۆ پێشکەوتنی کورد
هەوڵ دەین تا بگەینە قەسدی خۆمان
براینە...
براینە ئەگەر زۆر چاک نەخوێنن
لەژێر باری جەهالەتدا ئەمێنن

# گۆرانیی پیرەمەگروون

لەسەر وەزنی (بز برنجی الایدگز)

پیرەمەگروون! موقەددەسی
دۆستی دائیمی کوردی
بەو مەنزەرەی شیرینەوە
دافیعی سەد نەوع دەردی

قامەتی بەرزی تۆ
دامەنی سەوزی تۆ
نیشانە و ڕەمزی تۆ
باعیسە لەبۆ سەرکەوتنی وەتەن

فەسڵی زستان بەرگی سپی
ئەپۆشی و چوویتە ئاسمان
سەیری هەموو دنیا ئەکەی
تۆی شاهەنشای شاخەکان

کۆمەڵ گەوهەری
هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری
باعیسی لەبۆ نەهێشتنی میحەن

چونکە دۆستی ئەجدادمانی
نووری چاوی کوردانی
بەردت هەموو دانەی گەوهەر
لائیقی فەخر و شانی

کۆمەڵی گەوهەری
هەیکەلی زەفەری
لابەری کەدەری
باعیسی لەبۆ نەهێشتنی میحەن

# گۆرانیی تانجەڕۆ

لەسەر وەزنێکی تایبەتی

ئاوی تانجەڕۆ

گەوهەری هەموو شاخی کوردانی

خۆمانی

بەراوی تۆ

سەر بەڕزق و خێرە پڕ دەغڵ و دانی

زۆر جوانی

تەوسیفی تۆ

قەت نایەتە تەقریر و نووسین،

هێندە پڕ فائیدەی جوانی،

باعیسی ژینی قەومی کوردانی،

خوڕەی ئاوەکەی تۆ هەموو غەمێ لە دڵ ئەبا

سەوزایی دەوری تۆ عالەمێ پڕ سروور ئەکا

مەنزەرەی تەبیعەت

هاوتایی بەهەشتی فیردەوس ئەکا.

## گۆرانیی گۆیژە(١)

شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە باعیسی کەیف و سروور

هەردەمە بەرگێ ئەپۆشێ، گا سپی، گا سەوز و سوور

وەسفی قەومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو ڕەنگانەوە

ڕەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کە قەومێکن جەسوور

بەرگی بێ گەرد و سپیشت زاهیرە هاوار ئەکا:

قەومی کورد دڵ ساف و پاکە میللەتێکە بێ قسوور

بەرگی سەوزیشت ئەڵێ: ئەم خاکە هەر شینایییە

پڕ لە دەغڵودان و کانی سەر بەڕزق و پڕ لە نوور

ئەی وەتەن! شایانی فەخری، واجبە مەدحت بکەم

دار و بەردت عەینی گەوهەر، خاک و خۆڵت وەک بلوور

(١) لە بەیازی مامۆستا حەمە بۆردا (هۆشەنگ) ئەم هەڵبەستە بەهی بەختیار زێوەر دانراوە و نووسراوە بەهەڵە دراوەتە پاڵ بێکەسی مەزن. ناوبراو دەڵێ من زۆر زۆر دڵنیام کە ئەم هەڵبەستە هی بەختیار زێوەرە، چونکە چەند جار لە خۆیم بیستووە کە وتوویەتی ئەم هەڵبەستە بەهەڵە بەناوی (بێکەس)ەوە بڵاوکراوەتەوە.

***

تێبینی: لە ١ی مارتی ١٩٢٨ی میلادییەوە ئیتر شیعرم نەوتووە هەتا ٣ی تەممووزی ١٩٣٨ی میلادی، واتە ٩ نۆ ساڵ و ١٠ دە مانگ ئیتر لەوەودوا مەیلی شیعر دانانم کرایەوە، تەماشای بفەرموون ئەم تەخمیسی غەزەلی (حافز)ەشم کە هی ئەو دەورەیە لەبیرم چووبوو وا نووسیمەوە لە دوای ئەوە مولاحەزەی بفەرموون – لەگەڵ ئەوغەزەلەشدا کە لە دوای دێ:

بەختیار زێوەر

## تەخمیسی غەزەلێکی حافظ

وام لە بەحری ئەلەما ناگەمە سەر خەتتی کەنار
زار و غەمگینە دڵم، بوومەتە قەقناس و غویار
خادیمی سروەیی تۆم، بۆم بکە تەدبیر و چار
(ای صبا نکهتی از کوی فلانی بمن آر)
(زار و بیمار غمم، راحت جانی بمن آر)

خۆت ئەزانی چییە دەردم بکە تەدبیری مراد
بکە چارم بەشنەی خۆت بکە تەنویری مراد
بۆ ئەوەی بژیەمەوە بیگرە نێچیری مراد
(قلب بی حاصل مارا بزن اکسیر مراد)
(یعنی از خاک در دوست نشانی بمن آر)

ئێشی دڵ عاجزییە دائیم و دەرهەم هەر مەست
چەشنی مەخمووری شەراب، بووم لە فیراقا سەرمەست
چونکە دائیم لە غەمام شادییەکم نایەتە دەست
(در کمین گاه نظر با دل خویشم جنگ است)
(زابرو غمزەی تو تیرو کمانی بمن آر)

وا ئەسیرم بەجەمالی ڕوخی تۆ تازە سەنەم
نییە قووەت لە زویانا کە تەواو شەرحی بدەم
دلبەرا! وەختە برۆم ڕاکەمە دنیایی عەدەم
(در غریبی و فراق و غم دل پیر شدم)
(ساغر می ز کف تازە جوانی بمن آر)

ساقیا! بێنەرە مەیدان مەیی مەقبووڵی زەمان
ڕامەوەستە توخوا تێی بکە فنجان فنجان
تێ کە بۆ ڕەخنەگریش تامی بچێتە ژێر دان

(منکرانرا هم ازین می دوسه ساغر بچشان)

(وگــر ایشــان نســتــانند روانی بمن آر)

وا بەهارە هەمــوو دنیــا ئەچنە ســەیری چەمــەن

عــاشــقــان بەزم ئەکــەن و ئەهلی ڕیا تاعــەت ئەکــەن

گوڵ و لاله و ســەمەن و سونبول و نێرگس هەموو هەن

(سـاقـیـا عـشـرت امـروز بەفـردا مـفگن)

(یا ز دیوان قــضــا خط امــانی بمن آر)

بەســزا و جــەور و جــەفــاکــەت دڵمت کــردووه کــفت

چ نیگارێکی نه ئەمــــدیتێ بەڵێنێک و نه گــــفت

(فــایقــا) مــەســتی بکه ســەر له خــەمی بادەیی مــفت

(دلم از دست بشد دوش چو (حافظ) میگفت)

(کی صــبــا نکهــتی از کــوی فــلانی بمن آر)

## له حەسرەتی قەدەمی بەهار

له حـــەســـــرەتی قـــەدەمی بەهار گـــوڵی وشکی ئەرز ژیایەوە
لەبی غـونچـەو و گـوڵی یاسـەمین بەقـدوومی بەهـاره گـەشـایەوە
بەتەبەسـسـومی ڕوخی نـازەنین کـەژی خـەفـەت و مـەرارەتی دڵ
وەکـــو بەفـــری شـــاخـــه بڵندەکـــان بەهـەتاوی بـەهار دەتوایەوە
کەڕەتێ له چەمەن نەزەرم ئەکرد له گوڵ و له بولبول و عیشقیان
هەچی بولبـوله لەباتی گـوڵان بەتـەغـەننیـیـان ئەخـولایەوە
چ مـــەنازیرێکی عـەجـەب لەتیـفی هـەبوو له بەری بەیانیـیـا
قەدی گیا بەچەشنی ڕوو زوڵفی یار بەنەسیمی سوبح ئەگەشایەوە
بەنیگای سـرووری شـەواهید و تـەبەسـسـومی لەبی ئاڵی دۆست
کـەمـەری ئومـێدی ڕەقـیبی بەد وەکـو جیم و نوون ئەچەمـایەوە
له بەهاری پڕ فـەرەح و سـرووری وەهـا کـه عـالەم بێ غـەمـه
بەشی من کـه (فـایق)ی زێوەرم له غـەمی زیاد چ نەمـایەوە

تێبینی: تەئریخی تەوەللودم که عیبارەته له ١٩٠٨ی میلادی بەو پێیه تەماشا بکەین له ١٧ ساڵییەوه تا ٢٠ ساڵی شیعرم وتووه، بەڵام ئەو فەترەیه که ٩ ساڵ و ١٠ مانگه وەستاوم. له عومری ٣٠ ساڵیدا دەستمان پێ کردەوه، بزانین خوا چی دەکات. ئیتر تەماشا بفەرموون دەبینن که ئەشعاری دەوری ئەخیر چ له مەعنا و چ له ئیتتیجاهدا فەرقێکی زۆری هەیه لەگەڵ هی لەوەپێش.

بەختیار زێوەر

***

## مەتەڵ

لە گۆڤاری (دیاری کوردستان) ژمارە ١ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/١١دا لەلایەن ساڵح زەکی بەگی ساحێبقرانەوە کە خاوەنی گۆڤارەکە بوو ئەم مەتەڵە بڵاو کراوەتەوە:

شارێکی خۆشناو موسبەت و مەنفی
لەم سەر و لەو سەر مەعنای دوو حەرفی
سەر هەڵوەشێنێ قیمەت ئەبەخشێ
دیوار برمێنێ قووەت ئەبەخشێ
گەر بێ بناغەی هەڵگیرێ و گوم بێ
ناوی بڵندی ئەو وەختە هەڵدێ

لە ژمارە ٣ی هەمان گۆڤاردا کە لە ڕۆژی ١٩٢٥/٤/١٣دا دەرچووە ئەم وەڵامە لەلایەن (بەختیار)ەوە دراوەتەوە:

## هەڵهێنانی مەتەڵ

جەوابی مەتەڵ شارێکی خۆشناو
وا عەرزت ئەکەم ئەی حورمەت گیراو
لە شاری کوردان جەننەتی سانی
ئەگەر حەز ئەکەی ئەتۆ بیزانی
ئەووەڵی (بێ)یە ئاخرەکەی (هێ)
بێ چەندە خۆشە (بانە) ئاوا بێ
(با) بۆ موسبەتە (نە) بۆ مەنفییە
(بانە) دوو هیجا و چوار حەرفییە
ئەووەڵی لابەی (ئانە)ی قیمەتدار
دیوار برمێنی (بنە)ی قووەتدار
(هێ)ی لێ لابەری (بان)ێکی بەرزە
یاخوا مەحفووز بێ لە بەڵا و تەرزە

محەمەد فایق

لەلایەن گۆڤارەکەیشەوە ئەم ڕستەیە لە دوای هەڵهێنانی مەتەڵەکەوە نووسراوە: (ئافەرین ڕووی بابت سپی بێ) (الولد علی سر ابیە)، ژمارەی یەکەم و دووەممان بەپۆستەدا بۆ ناردی، ئابوونەی شەش مانگمان بۆ قەید کردی، خوا میسالت زیاد کا. بەرخورداربی.

دیاری کوردستان

# ئەم کوردە

ئەم کوردە کەوا ئێستە لە هەر مەرتەبە دوونن
هەر مایلی بێ عیلمیی و دواکەوتن و بوونن
ئیمڕۆ لە جیهانا نییە ئینسانێ بەبێ ئیش
خەڵقی وەتەنی ئێمەیە بێ کار و چەتوونن
تا فیکری بەدی مەسکەنی ناو میللەتی کوردە
باوەڕ بکە تا ڕۆژی حەشر خوار و زەبوونن
ئەی قەومی زەلیل عەسری تەقەددوم سەرە ڕێتە
ئەم عالەمە هەر پێش ئەکەون مەستی فنوونن
عەیبە، حەسەد و بوغز و نیفاق ڕۆژی نەماوە
عیلم و عەمەلە ڕۆحی بەشەر، زینەتی ڕوونن
بۆ خزمەتی ئەمڕۆ و سبەی سەیری غەرب کەن
یەک لەحزە نەبوون غافڵ و ئەربابی شئوونن
تۆش نۆرەتە ئەی میللەتی مەزڵوومە هونەر کەی
خاوەن دڵ و گیان و هونەر و گەرمیی خوونن

# کوردینه

کـــوردینـه! وەرن با لـه خـــەیاڵی هونـەرا بـین
بۆ عیلم و ئەدەب گورج و لـه ڕێگەی سەفـەرا بین
بۆ ئەم وەتەنەش هەر لە فیدای ڕۆح و سـەرا بین
مـەشـغـووڵی عـەمـەل، تالیبی ئەخـلاق و برا بین
چەند خۆشـه لە خـاکی وەتـەنا نوور و چرا بین

ئەم ڕۆژە وەتـەن ناڵەیی بۆ ئێـــمـــەیە یاران!
هاواری وەهـایە کـه بکەین سـەبقـەتی جـاران
کەمتر نییه ئەولادی لە کەس، شـاری لە شـاران
ئەمما سـەد ئەسەف نـایەتە گوێ گریەو و زاران
تاکـەی لە تـەوەللای وەتەنـی وەک کـوچەرا بین

مـەعلوومـه زەمـان پیـاوی کـەر و ئەحمـەقی ناوێ
ئەم عـەسـرە نەفـام و هـەزەل و سـەر ڕەقی ناوێ
هەمـــســـایە و ئەربابی عـــیلم نـاحـــەقی نـاوێ
ئەقـــوامـی زەکی ڕۆژی خـــراپ و شــــەقی ناوێ
نۆبـەی هونـەرە با لـه غــەمـی ڕێ گـــوزەرا بین

ئەم عـەسـرە زەمـانێکه تەقـەددوم غـەمی عـامـە
هـەر وەلوەلەیی عـیلمـە کـە ئومـمێـدی تەمـامـە
جـاهیل نـیـیـەتی مـەلجـەئو، پابەند و غـولامـە
ئەو قـەومـە کـەریمە بەتەمـای ئیش و کـەرامـە
ئەم دەورە لەبەر چی لە شەڕی بێ سەمەرا بین

ئـومـمێـــــــــــدی دڵـم هـەر وەتـەن و لاوی وڵاتـە
ئەو لاوە کـــه غـــایە و ئەمـــەلی بـەرزیی حـــەیاتە
ئەی کـــوردە وەرە نۆبەیی تەرفـــیع و نـەجـــاتە
عـالەم هەمـوو مـەشـغـووڵ و لە ئیشـا کـشـومـاتە
ئێمەش لە جەهلدا شەو و ڕۆژ مەست و خەرابین

# وەتەن

وەتەن تۆ مەكانێكی فەخری دیاری
وەتەن تۆ نیگارێكی سەرمایەداری
وەتەن تۆ گوڵێكی ئەنیسی حەیاتم
وەتەن تۆ نیشانی بێ قەراری
وەتەن تۆ نەمامی لە باغی جیهانا
وەتەن تۆ ئەمیرێكی دار و دیاری
وەتەن تۆ ئومێدی هەموو لاوی كوردی
وەتەن تۆ مەقامێكی فەزڵ و شیعاری
وەتەن تۆ هەناوی من و دڵفرێنی
وەتەن تۆ مەكانی شەهیدانی زاری
كەسێ قەدری تۆی لا نەبێ بێ دەماغە
بەئاب و هەوات جێگەیی ئیفتیخاری
لە وەسفی تەبیعەت زوبان لاڵە (فایق)
حەقیقەت بەهەشتێكی مەنزووری باری

## موعەللیم

مـــوعـــەللیم خـــوێنندنم با هەر مـــوتالآی حـــوسنی لەیلابێ
ســعـــووباتی حـــیـــســـابی نازەنینم ئێـــســـتـــە حـــەل نابێ
لە دەرسی عـــەشقی ئەودا ئێـــســتـــەکـە مـەشـغـووڵی ئامـینم
کــــەچی لای تۆ ئەبێ دەرسم لە نووکی فـــاتیـــحـــادا بێ
لە سەفحەی (لەوحی ڕەش) ناگەم ئیتر لێم مەگرە سا قوربان
لە شـــــاگــــردانی دانـانم مـــــوتالآم (لەوحی بەیزا)بێ
بەلوتفی ئەو نیگارە ســـەبری مـــافـــاتم ئەبێ ئیـــمـــڕۆ
ئەگـەر سـەفـحـەی ڕوخی مـەنزووری بەندەی بێ سـەروپا بێ
کـە دیم ئەو شـۆخـە زوڵفی گـرژ و لوولە و مـایلی عـیـشـوە
وتم: (مـەحـــبـــووسی زیندانە گـەدا بێ یان شـــەهەنشـــا بێ)
وەرە قـوربان! ئومـێدم ڕەحـمی تۆیە مـەرحـەمـەت فـەرمـوو
هـەتاکـــەی قـــەلبی مـــیـــسکینم لە وەســـڵی تۆ تەوەللا بێ
ڕەزا نابێ دڵم بەم حـــیـــشـــمـــەتی دنیـــایە بێ ئێـــوە
دەســـا فـەرمـــوو بەمـــیـــوانی دڵم وا وەخـــتـــە شـــەیدا بێ
لەبەر کــــەم تالیـــعی دوورکـــەوتەوە لێم تەلعـــەتی پاکت
ئەمـــان یاری وەفـــادار ڕێ نەدەی دڵ خـــوار و ڕیســـوا بێ
دەوای دەردی دڵی (فـــایق) بەوەســـفـی تۆ ئەبێ قـــوربان
ئەبێ بۆ ئینتـــیـــزاری مـــەقـــدەمت دائیم مـــوهـەییـــا بێ

# کاغەزێک بۆ باوکم لە بەغداوە

بەبۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە

بابە! ئەگەرچی ساکنی بەغدادی دلبەرم
هەرچەند ئەنیسی ئەهلی موجیدد و دلاوەرم
ئەمما کە یادی ئەو وەتەنەم دێتەوە خەیاڵ
دڵ عاجزە، موشەووەشە فیکرم، موکەددەرم
بابە! بەیادی ئەو وەتەنە و ئاو و خاکەکەی
زەڕڕاتی لەش بەیەکتر ئەڵێن: من موعەتتەرم
یادێکی مەعنەوی شک ئەبەم لەو وڵاتەدا
تەئسیر ئەکاتە سەر دڵی زاری موحەققەرم
ئەو خاکە پێم ئەڵێ بەحەقیقەت کە گەوهەرم
ئەو ئاوە پێم ئەڵێ بەتەبیعەت کە کەوسەرم
ئەو کوردە پێم ئەڵێ: (کەیومەرث) و (سکەندەر)م
ئەو ئەهلە پێم ئەڵێ بەشەجاعەت کە (حەیدەر)م
بەخوا لە دووریی ئەو وەتەنە و ئەهل و خاکەکەی
ڕۆژم بەمانگە، مانگ بەساڵ، تاجەکەی سەرم
ئەم جەژنە دێمەوە بەلیقای شاد ئەبم ئەگەر
چەرخی فەلەک خراپی نەکا هەرچی شک بەرم

## فایق زێوەر

لە نەسرا تالیبی بەست و بەیان نیم
لە شیعرا مایلی لەفزی گران نیم
دڵم زۆر پاکە دەرحەق هاووڵاتم
بەئوممێدی بەرات و ئاو و نان نیم
ئەوەی خوا دای لەگەڵ شوکر و قەناعەت
مودارای پێ ئەکەم هیچ میر و خان نیم
عەقیدەم پاکە دەرهەق خالقی خۆم
تەبیعیوون و زەندیقی جیهان نیم
لەگەڵ هاوجینسی خۆم نایێمە مەیدان
(بحەمدلیلا) سەگ و شێر و بەران نیم
کڵاوم گرتووە با نەیفڕێنێ
شەرەف لام خۆشەویستە، بێ ژیان نیم
لە ئەشعارم مەکەونە وردە شوبهە
بەوەڵڵا تالیبی ناو و نیشان نیم
قسوورم گەر ببێ مووجیب بەعەفوە
(شکسپیر) و (سەتلمان)ی زەمان نیم
مەڵێن (فایق) کەمە عیلم و کەماڵی
بەگشت ڕەنگێ لە ئەهلی ئیمتیحان نیم

# گفتوگۆ لەگەڵ سیروان

ڕووباری سـیـروان، بینای چاوانم
ڕۆحم قـوربانت، دەردت لە گـیـانم
هـاتوچۆ ئەکـەی سـەلامت کـوانێ
یاخۆ تۆش ئەڵێیت مەست و حەیرانم
دڵم پێت خـۆشـە خـەڵقی وڵاتـی
ئەحـواڵیـان چۆنە گـەلی لاوانم
تانوپۆ ڕەنگین، کـیـژی عـێلی جـاف
بۆم بەیان بکە حـاڵی کـوێسـتـانم
شاخی ڕەنگاورەنگ، خاکی پڕ ئاهەنگ
جـەنگەڵی شـێـران، چۆنە مـەیدانم؟
سـەرچاوەی ئاوات، هیـمـەتی پیاوت
کـوردی بێ باوت مـاوە بیـزانم
دەشتی پڕ گەوهـەر، ئاوی وەک کەوسـەر
نەشـئـەی نەشکاوە کـۆی هەورامـانم
سـیـروان ئەحـواڵی یار و ئەربابت
حـەوادیسـاتی ناو کـوردسـتـانم
بۆم بەیان بکە شـێـواوە حـاڵم
تـەسـکـیـنـی بـدە بـەدەرد و ژانم

## سیروان

(فایق)ی بەدبەخت! سەلامون عەلەیک
بۆچی شێواوی، کەی پەرێشانم
نەمناسیتەوە وەمزانی غەیرەیت
خۆ تێپەڕ نەبووم ڕۆحی ڕەوانم
هەزار سەلام و ڕەحمەتت لێ بێ
جا گوێ ڕابگرە بۆ داستانم
بەهار و هاوین پایز بێ غەم بووم
ئێستا موتیعی ئەمری زستانم
ئەمری پێ کردم هاتم بۆ بەغداد
ئەڕۆم میوانی بەحری (عومان)م
کۆمەڵی لاوان تا بێ گەرم ئەبن
پاشەڕۆژی کورد ڕوونە ئەیزانم
بەفرەکەی زستان کرێوە ئەکات
کیژی جاف ئەڵێت حووری عەدنانم
شاخی دەماغ بەرز خاکی لە سەد تەرز
بێشەی شێر ئەڵێ تەختی سلێمانم
سەرچاوەم پاکە، پیاوم بێ باکە
کوردم غەمناکە بۆ نیشتمانم
دەشتی بەرانان، ئاوی پڕ ئیحسان
هەورامان ئەڵێ کێوی جارانم
یاری ئەربابم دڵخۆش و شادن
عالەم کش و مات، ئیتر نازانم

## بەیادی ئەسیرییەوە

ئەی خـــودایە من لە تۆ ئەلتــاف و ئیــحــســـانم ئەوێ

دەفــعی جــەهلی مــیللەتی کــوردی پەرێشـــانم ئەوێ

بۆ هـەژاریی کـــــوردەواری وا پـەڕاگــــــەندە و زەبوون

یەکـیـەتی و ســەربەسـتیی و ئـەخـلاق و ویجـدانم ئەوێ

تا نـەمـێنـێ باری جـەهلی فــەردی مـیللەت یەک بـەیەک

ڕێگەی ڕاست و حـەقـیـقـەت، عـیلم و عـیـرفـانم ئەوێ

لەم جــەوانانە کـەوا هـاتوونە ســەر ڕووی نیـشــتـمـان

(چەرچل) و (ڕوزفلت)، (ئەتاتورک) و (ڕەزاخـان)م ئەوێ

چونکە وابێ نەشـــئـــەیە خـــاکی وەتـەن، پڕ زیللەتە

زەمـزەمــەی فـەسـڵی کـەریم خـان، دەوری بابانم ئەوێ

دەردی کـــورد زۆر بێ دەوایە بـاعـــیـــســی فـــەوتاندنە

ئەی خـــــودایە بـۆ دەوای ئەم دەردە، دەرمــــانم ئەوێ

ئەی ڕەفـیـقـان گـشت وەرن هـەوڵێ بدەین تا ســەرکـەوین

لاوی زیرەک، کـــوڕی ئازا، شـــێـــری مــــەیدانم ئەوێ

## بۆ ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠

ئەو کـەسـانەی گـاڵتـە بەم کـوردە بکەن بێـجـا ئەکـەن
تەرکی ئادابی مـرووەت، فـیکری بێ مـەعنا ئەکـەن
قەومی کورد ئاساری چاکەی زۆرە، تەئریخ شاهیدە
نەگبـەتی ڕووی کـردە ئێمـە بۆیە ئیستیهزا ئەکـەن
نامـدارانی وڵاتمان گـەهـ لە شـەرق و گـەهـ لە غـەرب
جونبوشی شێرانەو و تەسخیری بێ هەمتا ئەکەن
خـۆ کـەریم خـان و سـەلاحـەددین و شـاهانی بەبان
لاپەڕەی تەئریخی کـورد وەک کـاغـەزی بەیزا ئەکـەن
قـەهرەمـانانی وەتەنمان بۆ بڵندیی خـاکـمـان
مل بەسـێـدارەی بڵندی تورکی بێ پەروا ئەکـەن
زۆر نیـیـە خـۆم دیم ڕژابوو خـوێنی لاوانی وەتەن
هەروەکـو جـۆگـا لەبەر دەرکی سـەرا حـاشـا ئەکـەن
ئێـمـە ئەولادی ئەوانەین تێ بگەن ئەی دوژمنان
حـەملەیی شـێـرانەمـان هـەر مـاوە یاخـو ڕائەکـەن
ئارەزووی فـەردێکی مـیللەت وایە بۆ خـاکی وەتەن
خوێنی برژێ هەروەکـو پێشـوو شـەڕ و دعوا ئەکـەن
ئەی وەتەن بێ غـەم بە هەر تۆڵەت ئەسێنن لاوی کـورد
عـەهدە ناوەستن هەتا ئەم واجـبـە ئیـفـا ئەکـەن
خـوایە بتـبـینم وەتەن خـاکت بەخـوێنی دوژمنت
ڕەنگی سوور بێ چونکە وا فیتنە و جەدەل بەرپا ئەکەن
موتمەئیننم نامری با جەستەکـەیشت خەستە بێ
هـەر ئەبێ ئەو ڕۆژە هەڵبـێتن کـە ئاڵات وا ئەکـەن

## خەوبینینی کوردەواری

عەقیدەیەکی خراپ و بەرباد
لەناو میللەتا ماوە بێ بنیاد
ئەویش عەقیدە بەخەوبینینە
گوایە هەموو کەس پاک و بەدینە
حەزرەت کە فەرمووی (رؤیا الصالحین)
دەلالەت ئەکا لە پیاوی بەدین
ئەنبیای کیرام، ئەولیای کیبار
خەویان تەواو بوو بەئەمری جەببار
هەموو خەوێکیان ئەمری یەزدان بوو
کە هاتنەدیشی یەکجار ئاسان بوو
ئەمڕۆکە عیلم لە موعجیزاتە
سەیری خەو کردن زۆر خەرافاتە
بەڵام ئێستاکە لەوسا جیایە
نە عەسری نەبی و نە ئەولیایە
ئەم عەسرەی ئێمە خۆخۆیی باوە
ئەو کەرامەتەی پێشوو نەماوە
تەسەووراتی وەختی بێداری
دێتەوە خەومان وەکو هۆشیاری
زۆر جار هەندێ کەس کە خەو ئەبینێ
بۆی پەیا ئەکات (ئیبن سیرین)ێ
بە سەد ڕەنگ مەعنای لێک ئەداتەوە
هێشتا دڵیشی ئاو ناخواتەوە
لە هەڵەبجە بووم ڕێم کەوتە مزگەوت
دووانم دی یەکەم زوبانی نەسرەوت

وتی لە خەوما لەوحەیەکم دی
ڕەنگی ڕەش بەڵام بەختی سپی
لە ناوەڕاستی وەها نووسرابوو
(فلان کەس هاکا تووشی قەزا بوو)
وتم ئەم خەوە نابێ بەئەساس
هیچ دڵی خۆیشت مەخەرە وەسواس
وتی وا چاکە خەبەر بنێرم
ئاگای لە خۆی بێ من خاوەن خێرم
ڕۆژی قەزاکە بیست و سێی مانگ بوو
شوکور ئەو پیاوەش لە قەزا دەرچوو
عەوامی ئێمە چونکە جاهیلن
دائیم تالیبی فیکری باتیلن
یەکێ عاقڵ بێ گوێ ناداتە خەو
ناشپرسێ مەعنای چییە لەم و لەو
شاعیری مەشهور کە (نالی)ی ناوە
ئەم شیعرە جوانەی بۆمان داناوە
(تەعبیری خەیاڵ و خەو ئەگەر بێتە حیسابێ
دەروێش و گەدا شاه و، ئەبێ شاه گەدا بێ)

## باسی دونیا

گــەه بەفـر و بـار و بارش و سـەخــتی و مــەرارەته
گــەه گـــەردەلوول و تۆز و بـوخـــار و حـــەرارەته
سـەددی تـەریقی وەسـڵی مـوحـیـببـاتی عـالـەمـە
مـیحنەت هەمـیـشـە قـیـسـمـەتی ئەولادی ئادەمـە
دنیـا چ ڕەنگ ڕەنگە، گـەهێ سـووره، گـەه سـپی
باوەڕ نـیـیــە بە ڕاسـتی کـەوا ڕاســتــە یا چەپی
دەشت بوو بەشـاخ و شـاخ و تەپە چوونە ئاسـمـان
حـەیوان و تەیری وەحـشـی پەنـای خـسـتـە ناومـان
لەم بەفـرەدا بەسـەیر و هـەوەس مـەیلی ڕاو ئەکـەین
هەر شـەو خەیاڵی گۆشتی کـەوی سەر پلاو ئەکـەین
هەی هەی چ غــافـڵین و چ بێ باک و سـەرسـەرین
حـەیوانـی کـێـوی بێ خـەبەرە قـەومـی خـۆ خـۆرین
شـاهەنشـەهـی جـیـبـال مـەگـەر شـاخی بەرزی پیـر
ئەم سـیلسـیلەی جـیـبـالە لەژێر چاویا ئەسـیـر
وا سـەیری شەرق و غەرب و جەنووب و شیمال ئەکا
ئەم مــەنزەرەی لەتـیـفــەیە دەفـعی مــەلال ئەکــا
سوورکێو، سەگرمە، گۆیژەو و قەندیل[٢] سوپاهییە
تەخـتی زەمـینە، قـوببـەیی گـەردوون کـولاهیـیـە
ئەم بـەفـرە زیوی خـالیـســە یـا بەحـری یاسـەمین
یا قـەترەیەکی ڕەحـمــەتە کـەوتووەتە سـەر زەمین
سـەرچاوەیی حــەیاتی شــەتی دیجلەیە و فـورات
دەریایـی فـەیز و نیـعــمــەتە بۆ ئەهلی کـائینات
ئەمـڕۆ جەفـایی سـەردییـە، سبـحـەی سەفـای دڵە
ئەم بـەفـرە جـاذبیــەی تەرەب و شــەوقی بولبــولە

ئەی سەبزەیی بەهاری یو ئەی غونچەیی ئەمەل

لابەی لە چاوی ئێمە هەموو عیللەتی سەبەل

کەی تۆ لە خاکی پاکی وەتەن جیلوەگەر دەبی

کەی ڕۆشنیی دەروون و جەلایی نەزەر دەبی

دڵشادم ئیستە، ئاخری ئەم دەردە مەرهەمە

دوای عوسر یوسرە، نەسسی خوداوەندی ئەعزەمە[٣]

---

(١) مەبەست شاخی پیرە مەگروونە – مەحموود.

(٢) ڕیزە شاخێکن لە دەوروبەری سلێمانی – مەحموود.

(٣) ئەم پارچە هەڵبەستە لە (سۆزی نیشتمان)دا بەناوی زێوەری باوکمەوە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام پاشان کاک ئومێد ئاشنا ئاگاداری کردم کەوا لە ڕۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ١٤ی ساڵی ١٩٢٦دا بەناوی فایق زێوەرەوە بڵاوکراوەتەوە – مەحموود.

## ڕێگەی ژیانم

سـەد شوکـری خـودا پاکە دەروونم لە عـەداوەت

وەک بەعـزە کـەسێ نیـمـە دڵی پڕ لە قـەسـاوەت

ئەحــواڵی سـیــاســەت نە ئەپرسم نە ئەزانم

عــاشق بەقـــســەی عــاقڵ و دانایی زەمــانم

قـەت چەرخی فـەلەک ناکـەمــە دوژمن بەژیانم

چۆن دێت و دەچێ لەککەیی ئەو ناخـەمـە شـانم

قـەرزی ئەم و ئەو ناخـەمـە پشـتگوێ بەفـڕوفـێڵ

بۆ نـانی بـەلاش نیــمــە خــەیاڵێ کـــە ببم وێڵ

سـواڵی عـەرەق و ئەلبـیـسـە و قـۆندەرە ناکـەم

مـەیلی شـەڕە جـرت و قسـەیی مـەسخـەرە ناکەم

خـوو نادەمە سەر کۆنکەن و سەر پۆکەر و ڕامی

گوێ نادەمـە سـەر شـیـعر و غـەزەلیاتی غـەرامی

ئەم ڕێیـە کـە گـرتوومــە لەلام ڕاست و ڕەوانە

بەم ڕەنگە ژیـانی بەشـــەرییـــەت چ جـــوانە

لێرە بەولاوە زەوقـی خـۆم وام ئیـختـیـار کردووە هەر غـەزەلێک کە بیڵێم تەئریخی بنووسم و ئەو جێیەش بەیان بکەم کە لێی دانراوە، ئیتر لەوەدوا مولاحەزە بفـەرموون ڕەنگە دەستوورێکی خراپ نەبێ.

(بەختیار)

## باوەڕ مەکە

بەغدا ١٩٣٩/١/١٦

باوەڕ مــەکـە بەڕیشـی درێژ، پرچی گـرژ و لوول
ئیمـانی پوختی مـەتڵەبە ئەمری خـودا و ڕەسوول
سۆفی وەرە بەحـەزرەتی شێخ سـوێندی تۆ ئەدەم
بەسـیـە گـوریز و خـەڵوە و دانیـشـتنی مـەلوول
بەم گـرمـەگـرم و دەنگە کـە عـالـەم لە خـەو ئەکا
ئایا کــــەلامی ئێـــزەدی بـۆ تـۆ ئـەکـــا نـزوول
ڕێیــەکی ڕاســتــە دینی مـوبینی مــحــەمــەدی
ئیــفــراتی ناوێ، لادە لـە فـیـکری بەد و فــزوول
ئنجـا بـەسـیـدقی سـافــەوە ڕەنجێ بدە هـەتا
یەزدانی پاک موعـاوینـی تۆ بێ (عـەل ل ئوسـول)
دەروێش: لە داخی حـاڵەتی تۆ دڵ موشـەووەشـە
بەم زیللەتە سـەعـادەتی دونیـات ئەکـا (ئوفـوول)[١]
(فــایق) دەمــێکە تەرکی خــەرافــاتی کــردووە
ئیمـانی ساغە، بۆچی لە ڕێی حـەق بکا (عدول)

---

(١) افول: ئاوابوون.

بەغدا ١٩٣٩/٥/١٢

............................................. دیوجامە

دینداری فەخری هەموو ئیسلامە

پیاوەتی ئیشی هەموو دنیایە

ئازایی پیشەی گەلی ئەقوامە

چین ئەو شتانەی پیان ئەنازیت

چین ئەو ئیشانەی لای تۆ تەمامە

کێن ئەو پیاوانەی فەخری ئێوەبن

قوربان ئەو فەخرە بۆ خاس و عامە

فیکرێکی بۆشە وەحدەی عەرەبی

موعاوەنەتی ئێمە حەرامە......

ئێمە دراوسێ و براو هاوگیانین

بۆچی مەهتوکین سەیرمان حەرامە

کوردی عێراقی لە برسا ئەمرێ

مووچەش بۆ میسر و یەمەن و شامە

وریای خۆتان بن دنیا ئەگۆڕێ

نەتانبیستووە تاسی حەمامە

ئێوەش وەک تورک دەربەدەر ئەبن

ڕۆژی رووناکتان زۆر کەم دەوامە

بەتلی لی لی بە چەپڵە ڕێزان

دواتان ئەکەوین خەیاڵتان خامە

دێنەوە بەغدا بۆ خۆ هەڵکێشان

بۆ ئەو ئیشانەش کە زۆر بێ تامە

فەلەکتان ڕۆیی و مولْکیشتان ئەڕوا
هۆش پەیاکەن چاکە بۆ نامە
چاکەتان ببێ ئێمە دڵپاکین
بۆ بەدی چاومان لە ئینتیقامە

## تەرجیع بەند

سلێمانی ١٩٣٨

ئەی غـونچـەیی نێـرگـسی بەهاری
ئـارامـی دڵانـی بـێ قــــــــەراری
وەک لالـەڕوخــــــان و نـازەنـینـان
لەم باخــچــەیەدا چ جــوان دیاری
بەم ڕەنگە جــوان و بۆنە خــۆشــە
مــــەعلوومـــە گـــوڵێکی نـازداری
بەو قـامـەتی ڕاسـتی سـەرچەمـاوە
شـۆخـێکی لەتیـفی، هەم خـومـاری
ئیــفـتــادەیی خـــەڵک ڕاهـی تۆیـە
نازنـاوی عـــەجـــەم، گـــوڵی بەهاری
گــیــرۆدەیی داوی عــەشــقی تۆیە
(فـــایق) بەدڵی نەخـــۆش و زاری
ســەر هەڵبــڕە ڕووت ببــینم ئەمــڕۆ
با خــوێنی منت نەیێــتــە ئەســتــۆ
من بـولبــول و تۆ گــوڵێکی شـــازی
بێ فـیــتنەو و عــاشــقــان نەوازی
زامـی جگەرم مـــەخـــە بە نـاســۆر
بەم مـەسـتـیـیـەوە بەلەنجـە بازی
گـەردن کـەچی وەک غـولامی شـاهی
مـــوشکین نەفـــەسی بۆ دیدەبازی
فەڕاشی قەدەمتە بادی شـەب خێز
لەو جـێــیــە بەجێ دەبێ نیـــازی

عاشق بەڕوخی ئەتۆیە (مەحموود)
بەو نەشئەیەوە کە وەک ئەیازی
تەوسیفت ئەکەن جگە لە (فایق)
میسریی و عیراقیی و حیجازی
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ
مەدحێکی وەهات ئەگەر لەبەر بێ
دەرحەق بەگوڵێکی موعتەبەر بێ
گەر خوێندتەوە بەلەهجەیی خۆش
حەققە دەهەنت کە پڕ شەکەر بێ
بیخوێنەوە تۆ بەلەحنی داوود
گەردن کەچە گەرچی شێری نەڕ بێ
بەم حاڵەوە خۆشە لام بەقوربان
پێت چەند قسەیێ خراپ و شەڕ بێ
وا عومری عەزیز نەماوە زۆری
بادی ئەجەلم نزیکە بەر بێ
(فایق) ئەڵێ نوێ ببێتەوە عومر
ئەو شۆخە بەعیشوەوە ئەگەر بێ
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ
ئاساری گوڵانی نازەنینە
ئەم خەندە لەبیی و پێکەنینە
ئەم عیشوە بەنازکیی بەدەنتە
یاخو ڕەوشی غەزالی چینە
نەشئەی جلوبەرگی ئەتڵەسیتە
یا لەنجەیی حووری سەر زەمینە

ئازاری لەشم زیاد نەکەن لێم
زاماریی جەرگ و سۆزی سینە
ئەو شۆخە ئەگەر ببێتە باعیس
چاک بوونەوەی ئەم هەموو برینە
(فایق) بەدڵ و دەروون ئەڵێ پێت
ماشەڵڵا لە یادی ئەو نگینە
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ
ئەم شەوقە بەرەی جەمالی تۆیە
ئەم زەوقە خەیاڵی خاڵی تۆیە
(ئامین)ە کە (فاتیحە)ی کیتابم
تا غەمزەیی چاوی کاڵی تۆیە
ڕاستە کە قەدی سەر و سنەوبەر
وەک عەرعەری نەونیهالی تۆیە
تاقانەیەکی لە باغی گوڵدا
بولبول بەسەحەر بیلالی تۆیە
وەستاوە بەرەو ڕوخت هەمیشە
تالیب بەشنەی شەماڵی تۆیە
(فایق) کە مەلوول و ماتە دایم
هەر مونتەزیری ویساڵی تۆیە
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ
بێ شوبهەیە من کە جان نیسارم
پەروانەیی تۆیە قەلبی زارم
تەووافی حەرەمتم ئەر قبووڵ کەی
ڕاغیب بەچەمەنتم ئەی نیگارم

مەستانە سیفەت لە وەسفی تۆدا
گەه کەبکم و گەه وەکو هەزارم
سەد شوکری خودا لە لوتفی تۆوە
دوڕڕ و گەوهەرە یەغانی بارم
گۆشەی نەزەرت ئەگەر لە من بێ
ئیکسیرە لەبۆ غوباری نارم
مەئیووس نییە (فایق) ئەی پەریٚ ڕوو
بۆ مەرحەمەتت ئومێدەوارم
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ
ئۆخەی ڕەوشم تەریقی عەشقە
دۆزینەوەیی حەقیقی عەشقە
ئەم فیکرە کە لەش ئەخاتە جونبوش
تەئسیر و نەوەی دەقیقی عەشقە
موسلیم کە بچێتە ناو جەهەننەم
مەترووده تەواو تەریقی عەشقە
وەک شەمعی فەنەر بەشەو ئەسووتێ
چۆن عالەم ئەڵێن غەریقی عەشقە
کەی بێ لە قیامەتا بڵێن پێم
ئەمڕۆژە ئەمەش فەریقی عەشقە
وەک (نالی) و (سالم) و (وەفایی)
(فایق) کەمەکێ (حەریق)ی عەشقە
سەر هەڵبڕە ڕووت ببینم ئەمڕۆ
با خوێنی منت نەیێتە ئەستۆ

## تەرکیب بەند

ئاڵتوون کۆپری ١٩٣٩/٦/١

وەرە ئەی دلبەری حەمیدە سیفات
موو کەمەر، لەب شەکەر، ئەنیسی حەیات
بەکەلامت شیفای دڵم بۆ دێ
بەنیگاهت بەجێ دەیێ ئاوات
بەقسەی من بکەی زەرەر ناکەی
چونکە من خادیمم بەعەزم و سەبات
جەوری تۆ خۆشە لام بەڵام جارێ
بێ ویسالم نەکەی هەتاکو مەمات
دەردی عەشقت کوشندەیە گیانە
پێم کەرەم کە دەوا تەبیبی نەجات
من دەماغم لە حوببی تۆ مەستە
نامەوێ زەوقی عەتر و نوقڵ و نەبات
سەیری چیهرەت ئەکەم ئەوەند پاکە
سوورەتی خۆم دیارە وەک میرئات

بەقسەی خەڵقی خۆت مەتۆرێنە
دڵی (فایق) ئیتر مەڕەنجێنە

جاربەجارێ بەدیت ئەکەم لە خەوا
لە خەوی خۆش ئەبم لە نیوەشەوا
وا تەسەوور ئەکەم پەشیمانی
لەو سزایەی بووەتە هەدەر بە هەوا
دڵنەواییم ئەکەی لە هیجرانم
پاش ئەوەی دڵ کە کەوتە ساز و نەوا

(بارک الله) چ پاکـــه گـــیـــانی تۆ
گـوێ لە کـەس مـەگـرە توبێ زاتی خـوا
لـــە ڕقـــی دوژمـــنـــان وەرە چـــابـــە
هـەر لە هـیـــجـــرانـی تۆیە دیدە ڕوا
ســـــەردەمـێ یار و هـاودەمـی مـن بووی
پـێـم بلـێ بـۆچـی ئـیـکـە بـۆت نـەلـوا
وا بـزانم ئەبێـــســتــــــە دوژمـنـی تـۆ
هـەرکـــەسـێ لەو جـــەمـــالی پاکـــە دوا
تـا لـە دنـیـــــایـی ڕۆشـنـا مـــــــاوم
شـــەڕ و خـــێـــرت ئەنێـــمـــە ســـەرچاوم
کـــەوتە یادم مـــەحـــەببـــەتی جـــاران
ئیلتـیـفـات و مـوسـاحـەبە و عـیـنوان
عـیـشـووە و خـەندە و تـەبەسـسـومـەکـەت
مـەحـرەمـی بەندە باخـسـووس قـوربان
ئەو هەمـوو عـەیش و نۆشـە چوو لە دەسم
بێ پەنا مـاوم ئێـسـتـە سـەرگـەردان
چـۆن لـە دووریـت دڵـم نـەنـاڵـێـنـی
چۆن لە هـیـجـرەت سـەرم نەبێ حـەیران
چۆن هـەناسـەی دەروون نەگـاتە فـەلەک
چۆن جگەر لەت نەبێ لە داخی نیـهـان
چـۆن نـەڕێـژم لـە دیـدە خـــــوێـناوێ
ســــــەرزەمـین تەڕ بکا وەکـــــو باران
من ڕجـات لێ ئەکـەم ئێـتـر بەسـمـە
ئەم هـەمـوو زیللەتە کـە دیومـە عـەیان
ئێـــســتـــە وەخــتـی ویسـاڵی یارانە
عـەسـری بیـســتـەم بەکـەیفی ڕەندانە

تا هەوای عــەشــقی تۆ لەســەرما بێ
غــــــــەم لـە دڵدا ئـەبێ تـەوەڵلا بێ
گـیـان دەبێ دائیـمـا مـوفـەڕەح بێ
تاجی زیللی ئەگـــەر لەســــەر نابێ
ئێـسـتـە باکم لە تەعنی خـەڵق نیـیـە
لوتفی تۆ زەڕەیێ ئەگـــــەر مـــــابێ
بەســەری تۆ قــەســەم نیـیـە شک بەم
غــەیری حــوببت شــتێ لە دڵما بێ
ئاخ لە دەس جـــــەوری تۆ چ بێـــدارم
عـــاشـــقـــانت نزیکە شــــەیدا بێ
مـن لــە دووریـت دڵـم بـووە بـەتـەنـوور
تۆش ئەڵێـیت ئەم هەژارە ڕیسـوا بێ
بـۆ هـیـــــــلاکی ژیـان و زامـــــــاریم
چاری دەردم مـــــەگــــەر لەمـــەولا بێ
تۆ حـــەبیـــبی بەڵام وەفـــا ناکــــەی
تۆ تەبیـــبی کـــەچی دەوا ناکــــەی
بۆیە پێم خـــۆشــە گـریەیی خـــوێنین
شـــــــۆرەزاری دڵـم ئـەکـــــا ڕەنگین
وەکـــو گـــوڵ پێی دەپشکوێ گـیـــانم
چـەشـنـی بـاران لـە بـۆ زەویـی هـاویـن
تۆ لە بیـــــرم نەچووی هەتا زیندووم
من لە بیـــرت ئەچم بەبێ تەحـــسین
وەرە لابـە کـــــــودوورەتی قــــــەلـبم
دڵنیـــام کـــە لە فـــیـــرقـــەتی پڕ کین
وەرە با دوژمـنـان مـــــوکـــــــەددەر بن
ڕابوێرین بە شــــادی وەک پێـــشین

وەرە ئەی نەونەمــــامی پڕ عـــیـــشـــوە
چاوەڕوانت ئەکـــەم بەقـــەلبی حـــەزین
بەقـــــودوومت ســـــەرم لە ڕێتـــــایە
گیـان ئەکەم پێشکەشت بەسەد تەمگین

چاوەڕوانـت ئەکـــــەم بەخـــــەو تاوێ
تۆش مـــــەوەســـــتـــە وەرە لە ناکـــاوێ

## بۆ جلخوارەكان[1]

ئاڵتوون كۆپری– پردێ
١٩٢٩/٦/٩

خـاڵۆی توركـمان نـەوەی جـەنگیـزخـان
بۆچـی مـەحـزوونی كـەوتـوویە كـێـوان
ئەمـلات بەهەشـتی كـوردەوارییـە
ئەولات عـەرەبن زۆری شـارییـە
سـەرم سـوڕمـاوە واقم وڕمـاوە
تێم بگەیێنە چیت لێ قـەومـاوە؟
كـەوتە پێكەنین خـاڵۆی منەوەر
وتی بەسـەری (ڕەشـاد) و (ئەنـوەر)[2]
بەگۆڕی (غازی) و قـەبری (یوزدەمیـر)[3]
ئەمـڕۆ دڵخـۆشم ئەبمە جـیـهـانگیـر
وا تـورك دێتـەوە بـۆ نـاو وڵاتمـان
بەگـەورە و بچـووك ئەكـا خـەڵاتمان
ئەی ئەرقـەداشلەر ئەی ئەرقـەداشلەر
گـوێم لێ ڕابگرن وەك بەیتی عـەنتـەر
وتم: هـەمـوو تورك پـانزە ملیـۆنە
فـەتحی ئەم ڕۆژەی ئوسلوبی چۆنە
وتی: فـابریقـە و تەیارەی هەیە
مـودەررەعـات و سـەیارەی هـەیە
سێ ملیـۆن عـەسكەر هەمـووی پیـادە
ئەوەندەی تریش سـواری ئامـادە
تۆپی سـەحـرایی و تفـەنگی نایاب
وا مـوهەیـایە ئەگـاتە پەنجـاب

(ئەسکەندەروون) و (سووریە)ش ئەگرێ
ئەنجـا چاوێکیش لە عـێـراق ئەبڕێ
بابە بێـدەنگ بە تورک جـیـهـانگیـرە
ئەمـــە ئیـــرســـێکی باووباپیـــرە

ئەی ئەرقـەداشلەر ئەی ئەرقـەداشلەر
گـوێم لێ ڕابگرن وەک بەیتی عـەنتـەر

وتم: تورک ئێـــســـتـــە لەوەی لاداوە
وتی: مـیـســاقی مـیللی هەرمـاوە
وتم: نایەوێ خـــۆی بفــــەوتێنێ
وتی: ئاخــری شـــەڕ دەقـــەومــێنێ
وتم: بەتەنیـــا شـــەڕی بۆ ناکــرێ
وتی: ئەو قـەومــە گـوێ لەوە ناگـرێ
وتم: خـۆ کەرکـووک لەسـەر عـێراقـە
وتی: نەوتەکـەی مــایەی مــەراقــە
وتم: ئەی خــاڵۆ عــەقــڵت نەمـاوە
هەرچی دەفــەرمــووی خـــەیاڵ پلاوە
تورکی بێـچـارە مـەشـغـووڵی خـۆیە
تـۆش وا ئـەزانــی دڵــی لای تـۆیـە

ئەی ئەرقـەداشلەر ئەی ئەرقـەداشلەر
گـوێم لێ ڕابگرن وەک بەیتی عـەنتـەر

هۆ خـاڵۆ خـاڵۆ تۆ زۆر شـێـواوی
تۆش وەکـــو ئێـــمــــە برا خنکاوی
تا تورک لێرە بوو هەمووی دوژمن بوون
ئێستە کە ڕۆیی سینە کون کون بوون
وا ئەوان نایەن ئێـــوە ئوغـــرکـــەن
بەڵکو (ئەنقەرە)ش وەک خۆتان کەرکەن

بەخـــوا گـــەر تورک ئێــوەی دەسکەوێ

لێــتـــان مـــەعلووم بـێ ناگـــەنە شـــەوێ

من پێــتـــان ئەڵێم خـــەیاڵتـــان خـــاوە

تورک مـــەیلی ئێــوەی ئێــســتـــە داناوە

ئەگــــــەر لانەدەن لەم فکرە بۆشـــــــە

برایەتیــتـــان یەکــجـــار ناخـــۆشـــە

ئەی ئەرقـــەداشلەر ئەی ئەرقـــەداشلەر

گـوێم لێ ڕابگرن وەک بەیتی عـــەنتـــەر

---

(١) جلخوارەکان: بەو کەسانە وتراوە کە مەیلی عوسمانی و گەڕانەوەی تورکیان بووە.

(٢) مەبەست لە سولتان ڕەشاد و ئەنوەر پاشایە.

(٣) مەبەست لە غازی مستەفا کەمال، یوزدەمیر (زابتێک) ئەفسەرێک بوو - (د. عزەدین).

## ئەحواڵی شەربەکەم

ئاڵتون کۆپری ۱۹۳۹/۷/۲۸

ئەی شەربەکەم ئەی ڕەفیقی فائیق
ئەی بێ غەم و هەم لە گشت عەلائیق
ئەی سەنعەتی شاری جوانی بەغداد
وەی لابەری تینوێتیی پەریزاد
بۆ نازکی هەروەکو بلووری
غەم لابەر و، باعیسی سرووری
من خزمەتی تۆ بەفەرز ئەزانم
هەر ڕەونەقی تۆ ئەبێ نیشانم
جوابم بەرەوە ئەکەم سوئالێ
ئەم حەسرەتە با نەنێمە چاڵێ
بۆ چ دائیمی خاڵییە دەروونت
سەرەڕای ئەوە گەرمە ئاوی ڕوونت
ئەو پارەیە دام بەتۆ خەسار بوو
یا تالیعی من خراپ و زار بوو

## وەڵامی شەربەکە

ئەی فـائیـقی کـیـسـە پڕ لە درهەم

وەی زاڵمی بێ غــەمی مــوعــەللەم

ئەوسـا کــە منت کــڕی لە بـەغـداد

دوورکـــەوتمـەوە لـە خـــزمـی دڵشــاد

چۆن تۆ دڵت وەک تەنوورە بۆ خـوێش

بۆ گــــەرمی منیش وەهـایـە ئەندێش

وەک تۆ لە فـیـراق ئەڕێژی فـرمـێسک

تەبعەن کە منیش هەمە ڕەگ و ئێسک

ئاو دێـتــــــە دەرێ لە هـەردوو چاوم

دڵ گـــــــەرمم و لـەت بـووە هـەنـاوم

# لەسەر سەگرمە

سەگرمە ١٩٢٩/١٠/١٤

ئەم جێیە کوێیە من لێی دانیشتووم
یاران پێم بڵـێن تا نەڕۆیشـتـووم
چوار دەوری داوم دەوەن و کـــانی
دارســـتـــانێکە ســـڕی یەزدانی
فـــەرشم شـاخـێکە بڵند و نازدار
شـــەمـــاڵی لەنجـــە ئەکـــا بەنزار
ئەم لام (سەنگاو)ە، ئەو لام (قەرەداغ)
جـێگایەکی خـۆش، هەوایەکی ســاغ
چامـــان لێ ناوە ئەڵێی ســـەیرانە
خـــەمـــێکمـــان هەبێ دووریی یارانە
چین چـین ئاسکە دێنە بەرچاوم
سڵ ناکەن ئەڕۆن، بۆ سەیر وەستاوم
قـاسپـە قـاسپی کەو لەبن درەختـا
دەنگی پەلەوەر لە چیـای سـەخـتـا
قـیـــژەی منـاڵ و بارەی بزن و مـــەڕ
ئەم جێیە چۆڵەی کردووەتە مەحشەر
تیپ تیپ کـچـە جـاف ئاسک نازەنین
کــــە دێن بەرەو ڕووم دەم بەپێکەنین
منیش عـــاشق و پەروانەکـــەی یار
زامی دڵەکـــــەم دێتـــــەوە ئازار
شیـعر ئەخـوێنمـەوە، گـۆرانی ئەڵێم
ناڵەی خـۆم ئەکەم، لە دووریی لەیلێم

(فـــــايق) ولآتت دوڕڕو گـــــەوهـەره

سـەرچاوەی ئاوی چەشنی کـەوسـەره

شـاخی سـەگـرمـە قـوللەی (ئیـڤڵ)ە

فەرەح بەخشی گیان، موونیسی دڵە

ئەهلی هـەموو کورد، شیـرین کردارن

قـەومـێکی نەجـیب، هـەمـوو نازدارن

گـــیـــانت دابنێ لە بەر پێـــیـــانا

خـــاکی ڕێگابە لەســـەر ڕێیـــانا

مـیللەت و وەتەن بۆ تۆ مـەقـسـوودە

لەســـەر ئەو دووانە بکوژرێی سـوودە

## هاوار

ئاڵتوون کۆپری ١٩٤٠/١/١

ئەی بـرا کـــوردەکـــانـی ئاوارە
عـــەرزی ئێـــوە ئەکـــەم ئەم ئەفکارە
لە کـولّی دڵمـــەوە بەســـۆزی جگەر
دێتـــە دەر ئەم ســــەدایی هـاوارە
با هەمـوومـان لە خـاکی کـوردسـتـان
ڕێک بخـەین کۆمـەڵێکی غـەمـخـوارە
غـایەمـان ئیـتـتـیـفـاقی خـۆمـان بێ
مـــیـــر و ئاغـــا غـــەنیی و بێ پارە
یەکـــدڵ و یەکـــزوبان و ئازابین
بۆ تەرەقـــقـــیی وڵاتی بێـــچـــارە
ئەی براکـــانم، ئەی عـــەزیزانم
دڵ لـــە داخـــی وەتـەن بـــریـــندارە
عەسری بیستەم جیهانی ڕۆشن کرد
کـەچی بۆ ئێـمــە وەک شــەوی تارە
عەیبە چاومان لە خوانی خـەڵقی بێ
بۆ مڵ و مـــووشـی نەفـــسـی بێکارە
ئەجنەبی فـائیـدەی نیـیـە بۆمـان
بـەڵکـو وەک ئـەژدەهـای بریـنـدارە
کورد لە سـایەی کـەسـا بەپیـاو نابێ
کێ بەتـەنگ کـێـوەیە ئەوەش دیارە
ئێـمـە خـۆمـان ئەگـەر مـونەووەر بین
تێ ئـەگـەین دەورمـان هەمـوو مـارە

**

سەد ئەسـەف بۆ هەموو بەجێ ماوین
سەد ئەسـەف بووینە پیاوی ئەو خوارە
چەندە ناخـۆشـە لام کـە نیـمـانە
نە حکوومـەت، نە شـاهی خـونکارە
چەندە ناخـۆشـە لام لە گـوێم نایەت
دەنگی تۆپ، گـرمـەگـرمی تەییـارە
ئەوە بۆ چ وا لە ئێـوە قـەومـاوە
جـاهیل و دوودڵی حـوکـمـدارە
وەرن ئەی لاوەکـان دەخـیلتـان بم
دڵی مـیللەت هیـلاک و بیـمـارە
زووبەزوو عـیللەتی تەداوی کـەن
وەک پرۆفـسـۆر کـە لەش ئەکا چارە
گـەر نەجـاتی نەدەن، ئەوا ئەمـرێ
ئـەم ولاتـە عـەزیـز و نـازدارە
وەرن ئەی لاوەکـانی کـوردسـتـان
پشـتـیـوانمان خـودایی جـەببـارە
سـەربەخـۆیی بخـەینە بەرچاومـان
یەک کەوین هەر کـەسێ کە هۆشیارە
جـەژنی مـیللی نزیکە بۆ ئێـمـە
نەک بەگـوفـتـار، ئەویش بەڕەفـتـارە



## له قەڵای شیروانە (کفری)[1]

١٩٣٩/١١/٢٢

هەوارم ئەمڕۆ لەسەر سیروانە
بۆ نووستن ئەچمە (قەڵای شیروانە)
سیروان ئەناسم دۆستەکەی پێشین
بەڵام قەڵاکە قەسرێکە شیرین
بنچینەی قەڵا توورەکە رێژە
لەسەر ئەو قەڵا دوور و درێژە
چەند ژوور، چەند هەیوان، چەند پێچ و پەنا
سەر سوور ئەمێنێ لەو سەنعەتەدا
پیلانی وا جوان، قەڵای وا مەحکەم
بۆ عەقڵی قەدیم قەت باوەڕ ناکەم
عیلمی هەندەسەی تیا تەتبیق کراو
سەرەڕای ئەمانە نزیکە لە ئاو
نەقش و نیگاری فیکرێکی وردە
(ئەمە ئاساری عەتیقەی کوردە)

# نامەیەک بۆ هاوڕێیەک

لە پەراوێزی دەستنووسەکەی خۆیدا نووسراوە (نامەیەک بۆ هاوڕێیەک) مامۆستا حەمەبۆر دەڵێ ئەو هاوڕێیەی منم و، ئەم هەڵبەستە وەڵامی شیعرێکی منە کە سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێ ئەکات:

پایزە برا دۆستی شیرینم
بەدووریت هەتا بڵێی غەمگینم
لەوساوە کەوا لە تۆ بڕاوم
مات و زەبوون و خەستە هەناوم
بەینی من و تۆ برای شیرینم
بەجوغرافیا زۆر کەم ئەبینم
ئێوە لە بەغدا لەسەر ڕووبارن
کە خەیاڵ ئەکەم هەمووتان دیارن
وا شەو هات بەڵام شەوێکی خۆشە
مانگە شەو دنیا هەمووی خامۆشە
نامەم ئامادە بۆ شاری بەغدا
یا مانگ یا سیروان یەکێکیان ئەیبا
ڕێگە ڕۆینم لەم ژوور گەرمیانە
(پێباز) (پەیکوڵی)، (بانی خێلان)ە
عەشرەت بەعەشرەت تیرە بەتیرە
گەڕانی ناو جاف ئێجگار دڵگیرە
ئەڕۆم ئەگەڕێم بەسەیر و سەفا
خوا بەنسیبی ئێوەشی بکا
بن شاخی (بەمۆ) دەشتەکەی (پێباز)
پڕ لە کیژی جاف ناسک و نازناز

بەتیلەی چاوان جەرگم زامارە
بەلارولەنجە دڵ پڕ هاوارە
خڕەی هەیاسە، زڕەی کەمەرە
بۆ دڵی (فایق) چەرخ و چەمەرە
بەزوڵفی ئەمان بەستەی زنجیرم
یارەکەی خۆمیان بردووە لە بیرم
لەناو (شاتری) و هۆزی (گەلاڵی)
ئێستە کەوتوومە بەرگی عەودالی

# فەیەزانێکی ئاوی زێ

ئاڵتوون کۆپری ١٦/١٢/١٩٤٠

چلەی زســـتـــانە بۆیە ئاوەکـــەی زێ ڕەنگی گـــۆڕاوە
بەشـــێکی ئاوی بارانە و بەشـــێکی کـــەیشی بەفـــراوە
شـــەپۆلی پڕ تەوژمی دار ئەهێنێ، شـێـخـــەڵ ئەڕمـێنێ
بەمـیـقـیـاسێ کە نووسراوە ئیـتـر ئەم زێیـە هەسـتـاوە
چ هەسـتـانێ لە ئەهلی ئێـرە بووەتە ڕۆژەکـەی تۆفـان
کـەڵەک ناوێرێ خـۆی دەرخـا نەهەنگێکی لەبەر چاوە
مـەگـەر ماسـیگر ئەمـجـا بچنە ناو گۆم و قـەراغ زەلکاو
ئەگـینا ئاو ئەیانبـا چـەند کـەسی بەو جـۆرە قـووت داوە
خـەتـەر نووسین خـراپە با نەشـێـوێ شـارەکـەی بەغـدا
بڵێن شـوکری خـوداکەن مـەنفـەعەت بۆ بەسرەو و فـاوە
بەڵێ ئـەم جـونبـوشـــە هەر پێـشـــڕەوی سـەیلی بەهارانە
ئەناڵێنێ ئەگـــرمـــێنێ ئەڵێی شـــێـــرێکی ناوداوە
زەمـینی دەوروپشـتی سەوز و شـینە هەروەکو گـوڵشـەن
هەڵۆ لە لووتکە شـاخی بەردەمی هێند گـوژمـی لێـداوە
ئەگـــەر ئەم دێیـــە لێـرە باربکەن هـەقـیـانە لام چونکە
لەبۆ خـــــانوو دەر و دیـوار پلـنگێکی بەشـــــالاوە
تەدابیـری حـەسـاری مـەحکەمی پێ ناوێ بێ سـوودە
شەو و ڕۆژ جـەیشی جەڕراڕی لەهەر چوار لاوە کێشاوە
لە مـەنشـەء گـەر دەپرسن چونکە ئاوی شـاخی خـۆمـانە
زەرەر نادا لە عـــالەم بەڵکو نەفـــعی لێ بەجێ مـــاوە
فـیـدات بێ گـیـانی شـیـرینم وەتەن لەو خـاکە ڕەنگینە
شـــەتی زێ هـەر بەدار و گـیـــایەکـــەی باغـێکی داناوە

هەموو ئێوارە تێر سەیری بکەم هێشتا کەمە بۆ من
نەزەرگاهی تەبیعی ئاوی (نیل)ی خستە ئەولاوە
گەهێ سوورە وەکو دوو چاوی عاشق پڕ لە خوێناوە
گەهێ ئاڵۆزە وەک چاوی نیگاری تازە هەستاوە
زەمانێکە لەسەر ئەم ئاوە بەزم و کەیف ئەکەم بۆ خۆم
لەمەولا زۆر ئەترسم ئەمری نەقڵم بێ لە بەغداوە

## شارەکەم

سلێمانی ٦/١١/ ١٩٤٠

زینەتێکی هەیە سلێـــمـــانی
وەســـفی ناکــا زوبان بەئاســانی
کە تەمــاشـا ئەکەم سەفــای جـوانی
مـــورغی ڕۆحم ئەڵێ بەپەنهـــانی:
ئەی وەتەن، ئەی وەتەن چ شــیــرینی!
چەندە دڵگیـــر و چەندە ڕەنگینی!
مەنزەری دەشتی وەیس و کانێسکان
باغی میللی کە عەتر ئەکا پەخشان
گـــۆیژە و گـــردی یارەو و ســـەیوان
لادەبا حـــەســـرەتی دڵی ئینســـان
ئەی وەتەن، ئەی وەتەن چ شــیــرینی!
چەندە دڵگیـــر و چەندە ڕەنگینی!
هەر بەیانی کە زوو لە خەو هەستی
ســـەیری دونیــا بکە بەبێ هەســتی
شنەیەکی نەســیم بەســـەرمـــەستی
تەوقــیــێکت لەگـەڵ ئەکـا دەســتی
ئەی وەتەن، ئەی وەتەن چ شــیــرینی!
چەندە دڵگیـــر و چەندە ڕەنگینی!
شاخەکەی بانگ ئەکا کە چەند جوانم
بێنە ســەر مـــەنزەری درەخـــتـانم
بەفــرە پۆدرەی ڕۆخی درەخـــشـــانم
پەلکە زێڕینە پرچی ســـەر شـــانم
ئەی وەتەن، ئەی وەتەن چ شــیــرینی!
چەندە دڵگیـــر و چەندە ڕەنگینی!

هێندە لام خۆشە ئەم زەوی و زارە
لای دڵی من بەهەشتی ئاوادارە
خۆزگە خۆشتر ئەبوو بەیەکجارە
مەدەنییەت ئەگەییە ئەم شارە
ئەی وەتەن، ئەی وەتەن چ شیرینی!
چەندە دڵگیر و چەندە ڕەنگینی!

# هەوای قەندیل

قەلادزێ ١٩٤١/٨/٨

داوێ بۆ تاوی پەرچەمی تۆ یاری مـــەســتـــە چاو
بازی دڵی نەزان بـوو بەتاو هات و کــــەوتە داو
ڕەنگ زەردم ئێـسـتـە تاوی نەمـاوە دڵەی هەژار
ئنجـــــا وەرە بزانە چلۆنە کـــــزەی هـەناو
هەردەم لە دوورەوە کـە گـوڵی ڕووت بەچاو ئەکـەم
وام مـەست ئەکـا نزیکم ئەکا سـەر بنێـمە جـاو
پیاوکوژ نەبووم بەبەندەوە بەند بووم بەمانگ و ڕۆژ
دڵسـۆزبە، ڕەنجی ئەم هـەمـوو ڕۆژەم مـەدە بەئاو
کـوێستـانی بن چیـاکـەی قـەندیلە جـێگەکـەم
هاوڕێم شـەماڵ و، تافگەی ئاو، شـوێنی بێ هەتاو
جـارێک وەرە بەلەنجـەوە دەسـتێ بخـەینە دەست
ئەم جـێـیـە خـۆشـە مـەینەتی دڵمـان ئەکـا بڵاو
چەند ڕۆژێ پێکەوە لەبن ئەو شاخە سەیر ئەکەین
کـاتێ بەجـێم بـهـێـڵی ئەڵێم کـامی دڵ تەواو

## پەیامێک بۆ یار

سلێمانی ٤/١٠/١٩٤١

دەمت کە غونچەیە چاو نێرگس و ڕوخت لالە
دڵێ کە عەشقی ڕوخی تۆی نەبێ کەڕولاڵە
زوبان لە وەسفی قەدت دائیما تەڕ و پاراو
سەرم لە عەشقی جەماڵت بەڕۆژ و شەو قاڵە
نەوەک دڵم بەخوا گیانە، گیانی شیرنم
لە دەوری شەمی ڕوخت وەک پەپوولە عەوداڵە
ئەگەر بەچاوی حەقیقەت نەزەر بکەی لە لەشم
بەشوعلەیی ڕوخی تۆ خۆت ئەزانی زووخاڵە
خەیاڵی تۆ لە دڵی دام بەجارێ ئاگری گرت
دڵم سەبوورە، سەرم پڕ سووروورە بەم حاڵە
چ بێ وەفای و جەفات چەندە زۆرە ئەی نازدار
ئەوی کە عاشقی تۆ بێ زەلیل و پاماڵە
مەنازە بەم هەموو حوسنە، وەفات ببێ چاکە
هەتاکو عاشقی خۆت ڕوو نەکاتە سەر ناڵە

## که سەیری کورد ئەکەم

سلێمانی ۱۹٤۱/۱۰/۳۰

کە سەیری کورد ئەکەم وا تێ ئەگەم کوردێکی خنکاوە
بە دوو کەس کوشتوویانە و ناشتوویانە و خوێنی فەوتاوە
ئەگەر باوەڕ ئەکەن ئەی هۆزەکەم لای من بەبیری خۆم
لەپڕ دێتە دەرێ لەو گۆڕە ئێستەش گیانی تیا ماوە
دەسە و خەنجەر لەپڕ هەڵمەت دەهێنێ هەروەکو زیندوو
ڕووەو دوژمن ئەچێ غەدری لەمەوپێشی لەبەر چاوە
ئەگەر هۆشی لە سەردا بێ ئەزانێ دوژمنی کێیە؟
هەقی خۆی لێ بسێنێ وەک ئەوان کردیان لە دوو لاوە
دەسا کوردینە تا فرسەت لە دەستایە و نەکوژراون
لەگەڵ یەک یەک گرن، دوژمن هەزاران داوی داناوە
گەهێ کوشتن گەهێ یەخسیر گەهێ هیجرەت گەهێ زنجیر
گەهێ سێدارەو و تۆپ و تفەنگی بۆت حەشار داوە
لە ئاگری داغەوە کوشتاری تۆیە تاکو لوڕستان
سەر و ماڵ و وڵاتت لای ئەم و ئەو بڵقی سەر ئاوە
ئەمە حاڵی وڵاتی کورد و کوردستانە شەو تا ڕۆژ
کەچی گەورە و بچووک کەمتەرخەمن بەم حاڵە شێواوە
وەرن ورد تا درشت هەروەک برا بین دەست لە دەستا بین
لە پێناوی یەکا سەر دابنێین هێزمان هەتا ماوە
وڵات ئاوا بکەین، پێشرەو چرای عیلم و مەعاریف بێ
سەنایع فێر بین ئەوسا ئەڵێن کورد خاوەنی ناوە
هەتا ئێمە لە جەهلا بین عەدوومان هەر لە شەوقایە
مەعاریفمان ببێ دوژمن بەدەستی ئێمە کوژراوە

## بۆ منالان

سلێمانی ۱۹٤۱/۱۱/۲۰

ئەی خـــاکی پاکی نیــشــتــمــان

ئەی خــاوەنی ناو و نیـــشـــان

ئەی بێــشـــەی شـــێــری ژیان

وا چاکـــە بۆ من تاکـــو مـــان

قوربانی تۆی کەم جیسم و جان

ئەی نیشتمان... ئەی نیشتمان

ســـیـــروان و زەڵم و تانجـــەڕۆ

لام ســـــەلـــــەبیلە بێ درۆ

باخـــێکی زۆر خــۆش ڕەنگ و بۆ

وەخــــتێ ئەبینم خــــاکی تۆ

گــۆیکەی هیـــوام دێتـــە چرۆ

ئەی نیشتمان... ئەی نیشتمان

شـــارت بەوێنەی مـــێـــرغـــوزار

دێـت بـووەتـە هـــاویـنـەهـــەوار

دەشت و چیات جێی ئیفتیخار

بۆ کـوردی کـەمـدەسـتی هەژار

گـــیـــانم فـــیـــدات لەیل و نەهار

ئەی نیشتمان... ئەی نیشتمان

ئەی دایکی بێ هاوڕەنگ و تاک

بۆ بێ کـــەســیت بووم دەردناک

شـــەرتە هەتا ئەمنێنە خـــاک

قـوربانی تۆی کـەم گـیانی پاک

بۆ خـــزمـــەتت نابم هیـــلاک

ئەی نیشتمان... ئەی نیشتمان

## تەماشایەکی زەمانە و ئەهلی زەمانە

چوارتا ١/١٢/١٩٤١

کـــردەی زەمـــانـە بردەیی لاوچاکی تیـــا نیـــیـــە
دوون پـەروەرێکە ڕاسـت و ڕەوانـی لەوا نـیـــیـــە
وەک پایەبەرزی ئێـسـتـە بەنووکی قـەڵەم نیـیـە
ئیـقـبـاڵ و دەوڵەمــەندی بەرەنج و دوعـا نیـیـە
کـاکـە بەنـان و خـوانـی زەمـان دەسـخـەرۆ نەبی
نانێکی ئەو قــرانێ ئەکـــا بێ بەها نـیـــیـــە
وا چاکــــە تێک نەچیت و هەوات بەرز نەبێ برا
وەختێ سـەرت بخـاتە سـەمـا بێ تەمـا نـیـیـە
دڵ ڕاگــرە خــــەریکی خــراپە و بەدی مــــەبە
گـیـــان با نەبێ نموونەی ئیـشت فـەنا نیـیـە
نامرێ ئەو کەسەی کە چاکەی جێهێشت لەسەر زەوی
مــردوو کـەسـێکە کـردەوە و ئیـشی چا نیـیـە
پەردەی زەمـــانـە سـەیرە لە فـیکر و لە سـینەمـا
وێنەی شـریت و دیمەنی ناو سـینەمـا نیـیـە
دوێنێ (ڕەزا)[١] ڕەزایی چ سـووک بوو بەتاجـەوە
ئیـمـڕۆش ڕەزای چ قـورسـە کـە دوو ڕۆژە شـا نیـیـە
ڕەنگێکی ڕشــتــووە فـەلەک ئەمــڕۆ بەعـالەمـا
ناچێـتـەوە، چ بلـحـە، ڕەش و پیـسـی وا نیـیـە
چاکـە نەمـاوە عـەهد و وەفـا بووەتە گـفـتـوگـۆ
هەرکـەس ئەبینی (بێنە) ئەڵێ جـارێ (ها) نیـیـە
عـالەم ئەبینی هەڵپـەیەتی و پارە مـۆڵ ئەکـا
تێـربوون نەمـاوە، سـواڵکەری ئێـسـتـە گـەدا نیـیـە

زۆرن لەوانە باخـــەڵی پڕ قـــەرز ئەکـــا بەڕۆژ
چاو برسـێـتی لە چاوی ژن و پیـاو جـیـا نیـیـە
ئای چەند برا و برادەری گـیـانیت هەیە کـە بووت
پارەت نەبێ برادەریی و مـــەرحـــەبا نیـــیـــە
هـاوخـــوێنی خـــووەتە داوی وەهـات بۆ ئەنێـتـــەوە
تیـــا دەرنەچی بزانە براتە، برا نیـــیـــە
باوەڕ مـــەکـە بەخـــزم و کـەس و دۆسـتی دڵفـرێن
تەنگانە بێـتـــە پێـشـــەوە خـــزمت لەلا نیـیـە
تا شک بەرن بەڕاست و چەپا مـاڵەکـەت ئەخـۆن
کـــاتێ نەبێ لە دوور و نزیک ئاشنا نیـــیـــە
باوک منـاڵی خـــۆی بەکـــەری ســـوخـــرە دائەنێ
ئەولادەکـەش لە عـاســتی ئەوا بێ هەرا نیـیـە
چاکـیـــان ئەناسم ئەهلی زەمـانە لە خـیلقـەتا
هـەر چاوەڕوانی چاکـــەیەکم رووبدا، نیـــیـــە
ئەو پیـاوە کـوانێ دەسـتی سـەخـای عـالەمی ئەگـرت
ئینسانی ئێستە شەرمی لە خەڵق و لە خوا نییە
هـەر فـــیـــتنەیی و درۆیە لە بەینی ئەم و ئەوا
دڵسـۆز نەمـاوە، سـێـبـەری عـەدل و وەفـا نیـیـە
وا چارەنووس کـە ئێـمـەی نووسـاند بەناســەوە
جـــارێ چوو، چارەی لە دەسی تۆ و منا نیـــیـــە
تف لەم ژیانە چونکە وەها دێ و بەســـەر ئەچێ
تف لەم جـیـهـانە جـێگەی عـەیش و سـەفـا نیـیـە
لەم چەرخی بەدڕەوشـتـــە خـــودایە هەزار ئەمـــان
ئەم ڕێیـــە چەوتە، ڕێگەی ئەهلی هەوا نیـــیـــە

(فــایق) دەخــیلە تووشی تەڵەی دەهری دوون نەبی
ڕەحــمی بەکــەس نەکــردووە، بۆ تۆش وەها نیــیــە
چاک بە و ڕەفــیــقــیی ئەهلی زەمــانە مــەکــە و بڕۆ
ڕۆژێکە کــەس نەمــاوە بڵــێن بێ خــەتا نیــیــە

............................................................

(١) ڕەزا مەبەست لە ڕەزا شای پەهلەوی شای پێشووتری ئێرانە.

## چوارینە

چوارتا ١٩٤٢/١/٣

شـێـوەت کـە هەڵی داوە لەسـەر چاوی خـەیاڵم
یادت لە دەروونمایە و پێی شــاه و قــەڕاڵم
نامــەت لەبری تاجی ســەرم زینەتی گــیــانی
هێشتاکو ئەڵێی نۆکەرم، ئەی هەشت بێ بەماڵم

# پیاوەکانمان لە ساڵی ١٩٤٢دا

سلێمانی ١٩٤٢/٣/١

لەم شـــارەدا گـــەلێکی بەناوی وەها هەیە
بێـــجگە لە خـــانوو، پارەی زۆری لەلا هەیە
هەر مەجلیسێ بچێ بەکەش و فش ئەچێتە ژوور
لەو ژوورەدا بەرامـبەری ئەو گیـان فیدا هەیە
بۆ باسی واریداتی زەوی و زار و مـــوڵک و دێی
زارێکی گـورج و هۆشی ئەرەسـتـۆی لەلا هەیە
باسی وڵات و مـەنفـەعـەتی نیـشـتمـان بکەی
ڕوو گرژ ئەکات و هەندێ قسەیشی لە دوا هەیە
مـەئـمـووریەت مـونافـەسـەیە لای خـەیاڵیـان
زوو ئەچنە ژێری گـەرچی لەوەشـدا سـزا هەیە
ســـواڵکەر لەوانە پارەی هیچ وەرنەگـــرتووە
خۆشیان ئەکەن بەگەورەیی میللەت هەتا هەیە
وەک مـاڵی زۆرە فـــیکری بڵندی لەلا نیــیــە
دەربەست نییە، لە پاشملە، جوێن یا سەنا هەیە
تووتی لەوانە زیاتر ئەزانێ بەگـــفـــتـــوگـــۆ
چونکە وەڵامی پیـاوی گـەدای (خـوا بدا) هەیە
ئاه! ئەی وڵاتی بێکەس و بێ پیـاوی ژیر و چاک
پیـاوت نەمـاوە خـزمـەتی تۆ ئێستە کوا هەیە!
توخـوا مـەڵێن ئەمـانە لە کـوردن لەبەر ئەوەی
کـورد پوولەکی نەبوون و، دەسی بۆ سەخا هەیە
ئەم دەســـتـەیە نە چاکـە ئەزانن نە پیـاوەتی
بۆ خـۆی و پارەیان بەخـودا ئینتـیـهـا هەیە

ئەو پیاو و ناو و دەوڵەتە ئەمرن بەیەک کەرەت
ئیشێکی وای نەکردووە ببیەم بەجا هەیە
ئەی کاسبی حەبیبی خودا بۆچی غافڵی
نامەرد بزانە دەور و خولت زۆر گەدا هەیە
دەستێ بدە لە باخەڵی پڕ نۆت و پارەکەت
باربووی هەزار بەخێری حەجی ماڵی خوا هەیە
شەو تا بەیانی مەستی هەزار ڕەنگ تەعام ئەخۆی
زۆریش لە خانەیا، نە کولێرە و نە چا هەیە
دەس گرتنێکی بێکەس و هاوسێی نزیکی خۆت
جوان چاکییە و لە لای خوداشت جەزا هەیە
ئیمڕۆ ئەگەر موعاوەنەتی قەومەکەت نەکەی
سبحەی کە مردی عالەمێ دڵخۆشە وا هەیە
هەستە مەوەستە چاکە لەگەڵ هاوزوبان بکە
شان و شەرەف لە خزمەتی بێ دەست و پا هەیە
ئەو وەختە پیاوی خزمەتی میللەت بکەی بەماڵ
وەرنە لە ڕێی وتاری زلا چەند خەتا هەیە
ئیشێ بکە کە سوودی هەبێ بۆ وڵاتەکەت
تا خەڵق بڵێن فلانە کەسیش وەک پەنا هەیە
بەم ماڵ و سەروەتە دڵی بێ دەس بخەیتە دەس
بۆ گۆڕی تەنگ بەچەشنی تەلی کارەبا هەیە
ئەو جێیە بەرزە تۆ هەتە، حەیفە سەخات نەبێ
خۆشت ئەزانی قەدری سەخی چەشنی شا هەیە
ئێستا کە فرسەتە بتەوێ یارمەتی بدەی
میللەت نەخۆشە پارەکەشت وەک دەوا هەیە
هەر چاوەڕوانی ئێوەنە بێدەسەلاتەکان
توخوا بڵێن دە وەرنەوە ئیمڕۆ عەتا هەیە

کــاکــه ئەگــەر ئەمــانە لەلات زەحــمــەتە وەرە
ڕەحــمێ بکە بە مـیللەتی خـۆت وەک غـەزا هـەیە
بەس ئیحتیکاری گـەندم و جۆ و شـەکر و چا بکە
بەس نرخی شت بگۆڕە کـە شـەڕ دوورە تا هـەیە
بازاڕی تۆ هـەناوی هـەمـــوو مـــیللەتی بڕی
لەو خەنجـەرەی تیجـارەتە سەد ڕەنگ سـەدا هەیە
چیت کرد لە چیت و خـام و بلووری کـە وا نەمـا
یا خـــوێنی قـــەومـــەکـەت ئەمـژی تا هەرا هـەیە
کـووتاڵەکـەت بەدەنگی تەلێ نرخی زیاد ئەکـەی[1]
خـــولیـــای (لۆرت)یت و لەســـەرتدا هـەوا هەیە
گوێ ناگری لە وەعز و نەسیحەت کە موسلیمن
بێ ڕەحم و خـــــائینی زەرەرت ئاشکرا هـەیە
بۆ نەفعی خـۆت حـەیاتی ولاتێ ئەخـەیتە مـەرگ
نرخ دائەنێیت و بانگیش ئەکەی هەی غـەلا هەیە
چی بکەم دیارە موسـتـەحـەقی لەعنەتی بەشـەرع
چاری غـەلام لە ڕەحـمـەتی ئێـزەد ڕجـا هـەیە

---

(١) دەنگی تەل: مەبەس تەلگراف بۆ کرانە بۆ گرانی و هەرزانی نرخی کەلوپەل.

## ساقی نامە

چوارتا ١٢/٤/١٩٤٢

ئەو پیـاڵە مـەیەی سـاقی بۆت هێنام
کـاتێ خـواردمـەوە ئاگـری تـێ بەردام
ئێستـەش هەر سـەرم لەوە سوورماوە
بـۆ چ ئاو ئـاگـــــری لەمـن بـەرداوە
سـاقی فـیـداتم دەروون سـووتـاوم
بۆ مـــەزە مـــاچێ نەدەی فـــەوتـاوم
زوو دەمت بێنە تێـر تێـر مـاچی کـەم
ئەوسـا بۆم تێ کە دەم دەم و کـەم کـەم
سـاقی تۆ کـەوا شـۆخ و شـیـرینی
کـــە دێیـــتـــە لەنجـــە ڕێگری دینی
جـارێ بەعـیـشـوە جـارێ بە بادە
حـــەســـرەتی دڵم هـەمـــوو بە با دە
سـاقی بەهـارە وەک جـانی جـانان
پیـاڵەکـــەت دانێ و بگرە یەک وچان
نەختێ تـەمـاشـای دەشت و چیا کـە
دنیـــا گـــوڵزارە بەزمێ بەرپا کـــە
نەغـمـەش شـیـرینە بە ئاوازی بەرز
دوو بەستەی کوردی بڵێ لە سـەد تەرز
نـەک من، دنیـایەک دڵی مـەحـزوونە
با دەرکـەین لە دڵ ئەو خـەمـە دوونە
جـارێ سـاقی بە، جـارێک دلبـەر بە
جـارێک مـوغـەننی فـەرەح ئاوەر بە

ساقی دەمێکە یارم تۆراوە
غەمی فیراقم ئێجگار کێشاوە
ئیمرۆ تووشت بووم خێرم تووش بووە
هەر بەئەووەڵ پێک فەرقم کردووە
ئەگەر ئەمجارە تازەی کەیتەوە
غەمی دووریی یار دوور ئەخەیتەوە
ساقی ها پارە ئەوە بازارە
شەرابێ بێنە بڵێ هی پارە
بێ غەل و غەش و پەمەیی و ساف بێ
مەقبوولی گەنج و پیر و ئەشراف بێ
نەشئە شکێنی شەمپانیا بێ
لابەری غەمی هەردوو دنیا بێ
هێندەم بۆ تێکە سێ ڕۆژ سەرخۆش بم
لارەلار بڕۆم هێندە بێ هۆش بم
ساقی زەمانی شادی کردنە
سبەی دووسبەی نۆرەی مردنە
بۆ ئیمڕۆ خۆشە ژیانی مەستی
چونکە ئەبەخشێ هەوای سەربەستی

# چۆلەکە

١٩٤٢/٥/٢

گۆڕینی هەڵبەستی (انا عصفورة الهوی)ی جەمیل صدقی زەهاوییە

من وەکو بێچووە چۆلەکەی خۆشی
هەموو بەیانی بۆ خۆم ئەخوێنم
کە شەو تێ پەڕی دنیا ڕووناک بوو
دڵخۆشم بۆیە واز لە خەو دێنم
چاوت هەڵبڕە خوشکی نازەنین
زەردە و پرشنگی ڕۆژ پڕ دنیایە
سەیری تیشکی ڕۆژ بکە چەند جوانە
دنیای داگیر کرد خۆشی ئێستایە
تەماشای دنیا بکە بەیانە
چاوت تێر نابێ ئەوەندە جوانە
هەموو پارچەیەک لە شاخ و لە دەشت
بەدڵ مەسرورە و بەدەم خەندانە
گوڵ پێ ئەکەنێ بەرامبەر بولبول
لەناو باخانا بەدڵی بێ غەم
شەماڵیش لقی دار دێنی و دەبا
لەسەر شاخ و دەشت، لەناو شیو و چەم
پێش ئەوەی بولبول هەستێ بخوێنێ
بەو دەنگە خۆشە بەبەزمی ڕەنگین
تۆش هەستە لە خەو هەردووکمان ئەچین
لەگەڵیا ئەڵێین یاخود گوێ ئەگرین

# تۆپەکەم

٣/٥/١٩٤٥ سلێمانی

گۆڕینی هەڵبەستی (کرتي ما احلاها)ی محەمەد بەهجەت ئەسەرییە

تۆپەکـــەم شــیـــرینە شکڵـی
شـەکـرە سێـوێکە خـڕ و جـوان
سـێـوەکــە ئەخـورێ بـەڵام ئەو
بۆ گــەمــە ئەیهـێنمــە مــەیدان

دائیـــمـــا بـۆ یاری ئەیبـــەم
بـۆ هـەوا ئەڕوا کــــە لێی دەم
دەرئەچـێ گـەر پێـمی لێ خــەم
دەنگی وەک تیـر دێتـە گوێمـان

بێـنـەوە ئـەی تیـــــپـی لاوان
با بەدەست بیگرین هەمـوومـان
یـا فــــرێی دەین و بچـین بۆی
شـەق شـەقێنە خۆش و ئاسـان

با هـەمـوو بەش بین بەدەسـتـە
دابـنێین چاودێر لە خــۆمــــان
هەرکـەسێ ســەرکـەوت بـەنازە
زۆر بەدەســتـە شێـری مـەیدان

## تەتەببوعات

١٩٤٢/٥/٢٨ سلێمانی

چوومە بنچینەی عولوومی (ڕەمل) و(جەفر) و (جەلجەلووت)[١]
تێگەیشتم زەڕڕەیێ نەفعیان نییە هەروەک (سرووت)
(ویفق)ی سێ سووچ و لەگەڵ چوار سووچ و پێنج سووچم کە دی
سووچەکانیان تێ گەیشتم، ئەی برا، لووت و بزووت
چەند کەڕەت نووشتەی ڕەشیم نووسی چ سوودێکی نەبوو
جەلبی دڵدارم ئەکرد ئەمما ڕەقیب بۆ لام بزووت
بۆ (عەزیمەت) خوێندنی جیننی لە وەختی نیوە شەو
(مەستەکی) و (جاوی) ئەسووتان دانە دانە و جووت بەجووت
طەلطەهیش یا (طەیرەهووج) سێ چوار هەزارێکم ئەخوێند
فائیدی چی؟ هیچ نەهات بۆ لام جنۆکەی ڕووت و قووت
تازە وا بام دایەوە و (بادانەوەش عەیبی نییە)
شوێن کڵاوی سەخری جیننی ناکەوم وەک مایە پووت
تۆ مەچۆرە لای قەشە و مالووم و مەللا، گەورە کچ
کردەوەی جوانت ئەبێتە واسیتەی تەعجیلی شووت
(ڕەمڵ) و (فاڵ) نامە و مەلای دین تێکدەری ژن تەفرەدەر
دەستەڵاتم بێ بەجارێ ئەیخەمە ناو چاڵەقووت
دار و بەردی شەخسەکانی کەس نەناس و بێ ئەساس
وا لەجێی خۆی تەخت ئەکەم ئەیکەم بەدەشتی جێگە جووت
لەم پڕوپووچانە ڕزگارم بووە و جارێکی تر
دەست لە ئیشی توڕڕەهات نادەم بەزاتی لایەمووت
خۆزگە وەک من تێ گەیبوم کوردەواریش وا ئەبوو
ئەم فروفێڵانە بۆ نانە بەتەحقیق و ثوبووت

---

(١) ئەو وشانەی ناو کەوانەکان مەلا نووشتە نووسەکانی سەردەمی پێشوو بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی بەکاریان دەهێنان چ لە نووسین چ لە خوێندن و چ لە بەکارهێناندا.

## دەنگێکی غەیب

پشتە - هەڵەبجە ١٩٤٢/٦/١٢

لەبن شــاخــێکەوە دەنگێ بەزاری
ئەهاتە گوێم بەشێوەی هۆزی ئاری
بەســۆزێکی دەروون ئەیوت برا گەل
چ خۆشە یەکیەتی بۆ کوردەواری
چ خۆشە دۆستی بەینی عەشایەر
لورِ و قەڵخانی، جاف و بەختیاری
نە وەک ئاژاڵی یەک تالان بکەن شەو
لە خوێنی یەکترا ببنە تەتاری
وتم هۆ هۆ فریشتەی بن چیاکە
قسەت زۆر جوانە بۆ ئامۆژگاری
بەڵام ئەو تۆوی جەهلەی وا لە کوردا
چرۆی سەوزە لە لادێی و لە شاری
بەسیچکان و بەمازوو تێ شکاوین
عیلاجمان ناکرێ وا زوو بەیاری
ئەگەر خۆمان بزانین هیچ نەزانین
ئومێدی یەکیەتیمان دێتە دیاری
نەقەڵخانی ئەچێ بۆ باوەجانی
نە جــاف و تاڵەبانی دێنە لاری
نە شاری دەست و پێی لادێیی ئەبڕێ
نە لادێیی ئەچێتە پێستی شاری
نە ناکۆکی ئەبێتە گونکی سەر دڵ
نە کینەی دڵ ئەمێنێ کاروباری

بلێم چی خۆبەخۆی یەک زۆر خراپین
بەوێنەی خـوێنە خـوێن بۆ نالەباری
ئەگــینا پیــاوی زانا تێ ئەگــا زوو
کە (خۆشـە یەکیەتی بۆ کوردەواری)

# پەپوولە و گوڵ

سلێمانی ١٩٤٢/٧/١١

**پەپوولە:** ڕۆژباش ئەی خوشکی تازە ساڵ
ئەتبینم وەک بووکی ناو ماڵ
باران هەر لە تۆ ئەباریٚ
شەونم ڕووت ئەشوا بەجاریٚ
ئاوت ئەدا و جوانت ئەکا

**گوڵ:** ڕۆژباش و ژیانت چا بیٚ
دوور بی لەوەی دڵ تێک ئەدا
سەرم سوورماوە تیٚ ناگەم
تۆ تەیری یان گوڵ لێرەدا
جوابیٚ بدە من تیٚ بگەم

**پەپوولە:** ئەبینی من گوڵم ئەفرم
لە باخانا گوڵێک ئەگرم
ئەو گوڵە تێر تێر ماچ ئەکەم
بۆنی هەڵئەمژم دەم بەدەم
کە خۆشم ویست ئەچم بۆ لای

**گوڵ:** خۆشی بۆ تۆ وا سووک باڵی
ئەفڕیت بۆ هەرلا عەودالی
بۆ لای گوڵی جوانی بۆن خۆش
سەلامی من بکە پێشکەش
لەپاش ماچ کردن بێرەوە

## بەیداخ

وەرگێڕراوی شیعری ئەحمەد شەوقییە

۱۱-۱۹٤۲/۷/۳۱ سلێمانی

بۆ بەرزیی ولات بەیداخ نیشانە

بۆ سەلامی ئەو وەستان زۆر جوانە

منداڵی ساوای ناو نیشتمانە

بوەستن بانگ کەن لە دەشت و لە دەر

خوا بیپارێزێ ئاشتی بێ یا شەڕ

تاجی دەوڵەتی ئێستا و لەمەوبەر

خۆشەویست بووە و بڵند و سەروەر

دەستدار و بێ دەست ئەکا موزەففەر

بوەستن بانگ کەن لە دەشت و لە دەر

خوا بیپارێزێ ئاشتی بێ یا شەڕ

## دوو مەیموونی چێشت لێنەر

وەرگێڕراوی شیعری کامیل گەیلانییە

١١-١٠-١٩٤٢/٧/٣١ سلێمانی

دوو مـــەیموونـی زرنگ و جـــوان
بـاش ڕاهـاتبـــــوون بـۆ ژیـان
خـانوویەکـیـان بۆ خـۆیان کـرد
چێشت لێنان فێربوون دەستوبرد
لـــە ژیـــانـــا زۆر وریـــا بـــوون
بـۆ بـاربـۆی یـەک وەک بـرابـوون
ئیشـی سـەختـیان ئاسـان ئەکرد
ڕێـیـــان بەگـــشت هیـــوا ئەبرد
هێندە یەکتریان خۆش ئەویست
یەک لە یەک هەر چاکەی ئەبیست
یەکـــێـــتی هـی هـەردوو لا بـوو
لـە پـێـکـەنـین ئـاشـکـرا بـوو
دڵپـــــاک و دڵـداری یـەک بـوون
هەردوو لە یەک یەکجار مەمنوون
لاســایی ئینســـانیـــان ئەکـــرد
هـەر بـەقـــســـە ڕێـیـــان نەبرد

# ئەی ولاتم

گۆڕین لە جەمیل صدقی زەهاوییەوە

١١-١٩٤٢/٧/٣١ سلێمانی

ئەی ولاتم، ئەی ولاتم
نشتمانێکی چ جوانی
مەستی حوببی تۆم سەراپا
تۆش قوبووڵ کە حوببی جانی

ئەو دەمەی دڵ پڕ زووخاوم
بۆ سرورم تێ ئەکۆشی
خۆ ئەگەر خەو بێتە چاوم
جێگە خەوبینینی خۆشی

گۆشت و ئێسقانم لە تۆیە
خوێنەکەش وا جێی دەمارە
شەوکەت و شانم لە تۆیە
ژینی بەرزیشم کە دیارە

ئێسکی ئەجدادم لە تۆدا
دیارە وا گشتی ڕزیوە
تۆ لەش و گیانت بەمن دا
ژینی خۆم لەم خاکە دیوە

من کوڕێکی گیان فیداتم
تۆش تەواو دایکێکی چاکی
من کە سەربەستە حەیاتم
هەوڵ ئەدەم بۆ تۆ بەپاکی

بۆ ئەوەی تۆ پڕ سەفابی
خۆشە لام سەختی کە چابی
هەر ئەکەم مەدحت کە جوانی
وەختی ئێوارە و بەیانی

# من و بولبول

سلێمانی ١٩٤٢/٨/١

وەرە ئەی بولبـــــولی دڵگەرمی بێ تین
ئەوەندە مـــەفـــڕە بۆ لای گـــوڵ بەناڵین
لەســەر ئەو بنچکە نەخـــتێ بوەســـتــە
پشـــوویەک بە لە ناڵە و گـــریەو و شین
سکاڵای خـــۆت مـــەکـــە زۆر شـــارەزاتم
لە عەشـقا تۆ کە شای من ئەبمە فەرزین
وەرە با واز لە یار و گـــــوڵ بـهـــێنین
بچین بۆ ناو نزار و شـــــاخی ڕەنگین
تەمـاشـایەکی تاڤگە و شـاخی قـەندیل
لە دڵدا نەخش ئەکا خۆشیی هەوای ژین
لەوێ دەم تەڕ بکە و نەخـــتێ بخـــوێنە
کەلاوکەل بۆی ئەچین بۆ دەشتی پێنجوین
سـەهەند و قـەڵبـەزەی ئەم نەختـە خـاکـە
ئەمـاڵێ حـەسـرەتی ئینسـانی غـەمگین
لە خـــــۆشـــــیی ئـەم وڵاتە نازەنینە
بە سەد ڕەنگ بۆم بخوێنە بەرز و شیرین
منیش ئەوسا بەبەسـتـەی نیـشـتـمـانی
کەژ و دەشت پڕ ئەکەم تا گونبەدی شین
ئەگەر بێ و خوو بدەینە عەشقی وا ڕاست
ئەبینە مـــایەیی تەقـــدیر و تەحـــسین
وەرە بولبـــول، وەرە بولبـــول من و تۆ
گـوڵ و یار بەربدەین ئەم عـەشـقـە بگرین

## بۆ لاوەکانی سەر ئێستگەی ڕادیۆی کوردستان لە یافا

سلێمانی ١٧/١٢/١٩٤٢

دوێ شـــەو لە دەســـتی پەســـتی پەنام بردە ڕادیۆ
ڕوانیـمـە ئێـسـتگەکـانی ولآتـانی سـەربەخـۆ
هەریەک بەڕەنگێ دەنگی ئەهات پڕ لە جـوسـتـوجـۆ
(یافـا)م کـە کـردەوە بەهیـوای دانس و تیـاترۆ

سـۆزێکی نیـشـتـمـانی لە یافـاوە هاتە گـوێم
لەرزیم و ڕاپەڕیم لە قـسـەی ڕۆڵەکـەی ئەوێم

بانگمـان ئەکـەن بەکـوردیی پەتی وەک برا بژین
بۆ دوودڵی و خـراپە نەچین چونکە تیـا ئەچین
ڕێی یەکـیـەتی بەئێـمـە ئەڵێن فـەرزە گـوێ گـرین
لەم ڕۆڵە کـوردە دڵ بەپەرۆشـانە ئافـەرین

هەی هەی چ بەرزە سـەیر و هەوای ڕۆڵەکـەی وڵات
حـەیفـە بەغـەیری ئێـسـتگەیی یافـا ببێ لەلات

(ڕەمزێکی) کوردە دەنگی هەموویان شەپۆڵ شەپۆڵ[1]
(چالاک) ئەگـاتە شـاریی و کـوردانی شـاخ و چۆڵ[2]
(گـۆران)ە چاوی دوشـمـنی کـورد پڕ بکا لە خـۆڵ[3]
گەر بێ و بچێت و بەستە بڵێ جاربەجار (ڕەشۆل)[4]

ئەوسـا ئەبێـتـە سـەیر و سـەفـا بۆ هەمـوو کـەسێ
شـادی ئەبارێ گـەر بەری بـۆ ڕادیۆ دەسێ

ئەی (ژین) وەرە بەعـەشـقی نەسـیـمی بەیانیـان[5]
پێـشکەش بکە سـوپاسی من و هۆز و نیـشـتـمـان
بۆ لاوەکـانی ئێـسـتگەی کـوردی بەدڵ، بەگـیـان
ئەم خـزمـەتەی ئەوانە کـەوا کـورد ئەدا نیـشـان

عـــەرزیان بکە کـــە بیـــری کـــەسی ئێـــرەیان نەکـــەن
ئـەو ئیـــــــشـــــــەیان نمـوونەیـە بـۆ بـەرزیی وەتـەن

..........................................................

(١) رەمزی: مەبەست لە مامۆستای خوالێخۆشبوو رەمزی قەزازە.
(٢) چالاک: مەبەست لە مامۆستای خوالێخۆشبوو رەفیق چالاکە.
(٣) گۆران: مەبەست لە مامۆستای خوالێخۆشبوو عەبدوڵڵا گۆرانە.
(٤) رەشۆل: مەبەست لە هونەرمەندی خوالێخۆشبوو رەشۆلی حاجی عەبدوڵڵایە.
(٥) ژین: رۆژنامەی ژین. (مەحموود)

## سەیران

سلێمانی ٩/٤/١٩٤٢

چەند خـۆشـە زوو هەسـتی بەری بەیانـی
تـاریـک و لـێـڵ دەرچـی لـە ئـاوەدانـی
ورد ورد بڕۆی لـە دەشـتـەوە بـۆ نزار
گـوێ بگری لە ئاهـەنگی دەنگی باڵدار
یاخـۆ ڕووبکەیتـە سـەر قـەراغ ڕووبارێ
ئاوی وەکـو مـرواری بێـتـە خـوارێ
خـۆی پڕ لە مـاسی دەوری بێشـە و سـەوزی
دەنگی کنـاچەی پۆڕ ببـیـەی بەبەرزی
یا ڕۆژی جـەژنی ڕەمـەزان و قـوربان
وەخـتێ نـاو شـار ئەبێ بەشـایی و لۆغـان
چەند خۆشە دەوری پیرمەسوور لای هەستیار[١]
بێ غـەم ئەڕوا زەرد و سـوور بەلەنجـەولار
یـاخـۆ بـەهـاری سـاڵانی ڕابـردوو
کە ژن و پیاو لە سەیران بوون چوارشەممور
ژیانێکی خـۆش و بەفـەنتـازی بـوو
نە باسی (فـاشیـستی) و نـە هی (نازی) بوو
چەند ساڵە (هیتلەر) لێمان بووەتە شەیتان
بەزوڵم و زۆر ئاگـری شـەڕی هەڵگیـرسـان
خۆی مـاڵ وێران و قـەومی سـەرگـەردان کرد
گـوایا ئیـشی چاکی بۆ ئەڵەمـان کـرد
ویسـتی دنیـا داگـیـرکـا، خـۆی پاشـا بێ
بـابـە: لە پاشـای وا هـەزار حـاشـا بێ

ئێــســتــە نازی لە برســا ســەگ ڕاو ئەنێ

هیتلەر ڕۆژی سەد جار خۆی لە جاو ئەنێ

ئەمەریکا و ئینگلیـز و ڕووس سەرکەوتوون

نازی و فـاشـیـسـتی تووشی گـیـانـەلا بوون

بەم زووانە خـــوا بیکا تەسلیـم ئەبن

ئەمــجــا فــێــری ئەخــلاق و تەعلیم ئەبن

ڕۆژی تەسلیـمـیـان جـەژنە بۆ کـوردسـتـان

لەگەڵ سوێندخواران کورد ئەچێ بۆ سەیران

بەخـوا زۆر خـۆشـە لای کـورد مـژدەی زەفـەر

بۆ سـوێندخـواران خـوایە زوو بچێـتـە سـەر

(١) پیرمەسور (پیرمەنصور) مەزارێکە لە گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی لە جەژناندا منداڵان لەو ناوچەیەدا بەخۆشی ڕایان دەبوارد.

# مەناڵە ئەی دڵ

زمناکۆ ١٩٤٢/٦/١٧

مـــەناڵە ئەی دڵ ئارامت ببێ شـــێــرانە تا مـــاوی
لە پێناوی نیگارا کـۆتەیەکـیــان گـــەر لە پێ ناوی
هەزاران چاو و ڕاوت لێ بکەن قـەت سڵ مـەکە بۆ عەشق
بەچاوێ ڕاوکـــراوی تا بمێنی حـــەپس و گـــیــراوی
بڕۆ هـەر هۆگـری ئەو شـۆخـەبە، ئەو چاوە مـەسـتـانە
مەترسە هیچ لە تانەی خەڵق و کردەی چەرخ و بەدناوی
وەکـو بیـری من ئەمـڕۆ وردە خـاڵی دەوری گـۆناکـەی
وەکـــو هەڵبـەســتــەکـانم ڕێکوپێکە قـــەددی لاولاوی
ئەگـەر هـات و لە یادی لابدەی سـەبر و سـوبـاتت کـوا؟
لە عـەشـقی دولبـەرا بێت و نەسـووتێی دیارە خـرفـاوی
لە زمناکۆ بەخوڕ فرمێسک بڕێژە ساف وەکو سیروان
بەناڵەش ئەم کـەژە پڕکـە لە دووریی پەرچەمی خـاوی
ئەگـــەرچی بێ وەفـــایە ئەو نیگارە دائیـــمـــا بۆ تۆ
بەڵام تۆ شـێـوەیی سیدق و وەفـا گـەر بەرنەدەی پیاوی

# بایەگی بەیانی

سلێمانی ١٩٤٣/٦/١١

فـــیـــدات بم بایەکـــەی وەخـــتی بەیانـی
لەگــەڵ تۆ خــۆشـــە لای من زیندەگـــانـی
کـــەژ و دەشت و چەمـــەن ئەبڕی لە ناکـــاو
لە پیـرمـــام و لە قـــۆپی و مـــێـرگـــەپانی
گەهێ قەندیل ئەچی، گەهـ دەوری سوورکێو
ســەرەو ژوور جـار بەجـار لای گۆڵی (وان)ی
ولاتـی کـــــــوردەواری ڕاگـــــــــوزەرتـە
بەســـەربەســتـانە مـەشـغـووڵی گـەڕانی
بەیانیـــان من خـــەریکی (گـــا، مـــەلاس)م
لە ژوور ســـەرمی وەکـــو ئاواتی گـــیـــانـی
لە ســـــۆزەی فـــێنکت وا دێتـــە بیـــرم
ئەڵێی هەســـتـــە ئەگـــەر پەســـتی ژیانـی
غــــوباری ناو لەشت دەرمـــــانە بۆ من
پەڕی ســیـــمـــورغـــە بۆ نەرم و نیـــانـی
لە کـــاتێکا خـــەواڵووم خـــۆڵی چەند جێ
لە چاوم کـــــە کلێکە ئەســـــفـــــەهانی
بە بۆنی ئەو ولاتانەش کــــــــــە دیوتە
بهـــەنوە مـــێـشکم ئەی هاوڕێی نیـــهـانی
ئەگـــەر تۆ ئەم نیـــازەم جـێـبـەجێ کـــەی
منیش پەیمان ئەکــــــەم ڕاست و ڕەوانی
بەچاوی کـــاڵ و لێـــوی ئاڵ و خـــرخـــاڵ
ئیـــتـــر تەفـــرە نەخـــۆم وەک نانی نانی

بەچیهرەی یار و عیشوەی دڵ نەبەستم

بەخەندە پێ بکەنم تۆش پێ بزانی

شەوی وەسڵی بنێمە عاستی پشت گوێ

بەعەشقی یار نەچێژم شادمانی

سەرم تەرخان بکەم بۆ دەردی هۆزم

دڵم جۆش دەم بەعەشقی نیشتمانی

فیدات بم بایەکەی وەختی بەیانی

لە کوێی؟ هەڵکە. وەرە هاورێی نیهانی[1]

(١) لێرە بەدواوە، تا کۆتایی هەڵبەستەکە لەلای ئێمە نەبوو، لە دەستنووسەکەی مامۆستا حەمە بۆردا هەبوو بۆ تەواوکردنی هەڵبەستەکە نووسیمانەوە.

## پەیامێک بۆ یار

سلێمانی ١٩٤٣/٦/٢٧

بەچاوت سوێند ئەخۆم ئەی یاری نازدار
دڵم لای تۆ بوو، تاکو پار و پێرار
بەرۆژ هەر هاتوچۆم بوو بۆ تەماشات
بەشەو وەک کۆترێ بووم دەم بەهاوار
وەها جێگیر بوو وێنەی تۆ لە سەرما
خەو و خۆراک نەمابوو لام بەیەکجار
بەڵێ خۆش بوو لەلام ئەو تۆزە ژینە
کە رامانبوارد بەکوێریی چاوی ئەغیار
خودا هەڵناگرێ تۆیش دڵنەرم بووی
بەرامبەر من بەگوفتار و بەکردار
بەپەنهانی لە گۆشەی چاوەکانت
دەمم شیرین ئەبوو مانگی هەزار جار
لە تاریکیی شەوا هەروا لەبیرمە
من و تۆ پێکەوە بووین وەک گوڵ و خار
ئەوەندە لوتفی تۆم دیوە ئەگەر بێ
لەتم کەی جومگە جومگە نیمە ئازار
بەلام ئێستا ئەبێ تۆ لێم ببووری
وەکوو جاران کە نیمە مەیلی دیدار
شەوێ رێم کەوتە لای هەندێ برادەر
بەکوردی تێگەیشتووی ئەهلی ناو شار
یەکێکیان پێی وتم وەک سەرزەنشتێ
بەسێتی سەرپەرشتی خاڵ و ڕوخسار

گـــریمان پەیڕەوی ئێــــمـــــە نەزانی
بەئەشـــعـــار و بەکـــردار و بەئاســـار
لەبەرچی بولبـولی خـۆش خـوانی یاری
لە جیاتی نیشـتـمان و کوردی غەمبار
لەســــەر تۆ فــــەرزە بۆ بەرزیی ولاتت
شـەو و ڕۆژ هەر بنووسی نەثر و ئەشعار
کـەچی تۆ شـیـعـرەکانت بووەتە گـاڵتـە
بـەباسی وردە خـــــاڵ و زوڵفی دڵدار
وتم: یاران بەپارە و عــیلم و خــزمـــەت
منیش خـــۆ نیـمــە عـیلم و زێڕ و دینار
بەلام شـــەرت بێ هەتا مـــاوم لە دنیـــا
بەکــــردار و بەئەشـــعــــار و بەئەفکار
درێغی قــەت نەکــەم بۆ نیــشــتــمـــانم
هـەوڵ دەم من بەنووسـین و بەگـــوفــتـــار
لەمن دڵگیـــر مـــەبە ئەی یاری گـیـــانی
لە عـەشـقی نیـشـتـمـان کـەوتوومـە هاوار

### چوارینە

لە عەشقی یار و دەس لەملانی تۆیە
لە باسی لێو و چاوی جـوانی تۆیە
لە بادەی دەست و خــۆبادانی تۆیە
لە شیـعری عـاشقی و دانانی تۆیە[1]

---

(١) لە بارەی ئەم چوارینەوە حەمەبۆر ئەڵێ: لام وایە تاکە بەیتێکی تری بەدواوەیە کە نەوەختی خۆی لەگەڵ پارچە شیعرەکەدا لە گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە و نە لە دەستنووسەکەی لای منیشدا هەیە.

# دلبەرێکی خۆ وڵاتی

سلێمانی ١٩٤٣/٧/١

دلبــەرێکی خــۆوڵاتـی ئێــســتــەکــە دڵدارمـــە
بـۆیە دڵ پڕ ســۆزم و جــار جــار بەدەم هـاوارمــە
من ئـەگـەر لـەو تەلعـەتەی ئیلهـامی ڕۆحـانیم نـەبێ
چۆن خـەیاڵی فیکری بیکر و کەڵکەڵەی ئەشعـارمە
وەی چ عـەیـیـارە هـەزار مـەکری لەژێر سـەردا هـەیە
گــاهـ دڵ دز گــەهـ بـەعــیــشـــوە لابەری ئـازارمـــە
چاوی بازی هـەر بەچاوبازی خـــەریکی فــیــتنەیە
لەعلی لێــویشی ئـەزانم وەک مــەیی ســەر شــارمــە
حـەز ئەکەم تێر سـەیری چاوی کەم بەڵام مورغی دڵم
دێتـــە لەرزە و پێم ئەڵێ هاوار ئـەوە شـمــقــارمــە
نەوڕەس و نەوپێگەیشتوو، دەم بەخـەندە، بێ ڕەقیب
شــەرم ئەکا چونکە یەکـەم نازدارەکـەی ناو شـارمـە
زۆر دەمێ بوو وێڵی شۆخێکی وەها بووم سەد شوکر
تـازە وا دۆزیمـەوە مـن عــــاشـق و ئـەو یـارمــــــە[١]
بۆ یەکەمجار ئەو بوو دەرگای مەیکەدەی لێ کردمەوە
مەی گوسـاریی عەشقی هەر لەوساوە پیشە و کارمە
هەر ئەویش بتـخـانەیی فـێـرکـردم و لای دام لە ڕێ
تاکو ئێستاش جوانپەرستی شوهرەیەکی دیارمە
داخی داخـان زوو بەجێی هێشـتم بەتەنیـا مـامـەوە
خــەڵکی گــۆڕ و، من ژیانم جــێگە گــۆڕەوشــارمــە
وا بــەنـاچـاری و زەبوونــی یـادی بـۆتـە دلبــــــەرم
شــەرتە کــردوومــە و خـــەیاڵی دائیــمــا وادارمــە

.................................................

(١) لێرە بەدواوە، تا کۆتایی، هەڵبەستەکە لە لای ئێمە نەبوو، لە دەستنووسەکەی مامۆستا حەمە بۆردا هەبوو بۆ تەواوکردنی هەڵبەستەکە نووسیمانەوە.

## ژیانێکی بێ غەم

زێویە ١٩٤٢/٩/١٢

خـــوا بیـــدا بتـــبێ هـەندێ دێمـــەکـــار
بنـەتۆی خـــۆت جـــووتـەگـــای بەکـــار
دوو مانگا و بیست سـەر بزن و دە سەر مەڕ
ژنێکی دڵســـــۆز بۆت بێنێـــــتـــــە بەر
دوو بەرە و چیـــــغێ لەگـــــەڵ چەرداخێ
لە شـــــــارەزوور بی یا پـەنا شـــــاخێ
لە تواناشـــــا نـەخـــــتێ بـەخـــــۆ بی
لە دوای هێـڵی خـۆت مـەستی هۆ هۆ بی
بۆ خـــــوێندەواریش هێندە بتـــــوانی
(ژین) بخـــوێنیـیـــەوە و مـــەعنای بزانی
ئەگـــــەر ئەمـــانە بۆ تۆ یەکگیـــــر بێ
دەوڵەمـــــەندی، با، ناوت فـــەقـــیـــر بێ
هیـچ لازم ناکـــــا خـــــاوەن ئوتێل بی
بەدوای ئاواتا هـەمـــیـــــشـــــە وێڵ بی
ژیانت پڕە لە شـــــادی و خـــــۆشی
لە ڕەنجی شـــانت، ئەخـــۆی، ئەنۆشی
نانێکت ئەبێ دەســـــتــــدار و بێ دەس
دێن لەوێ ئەیخـــۆن بەکـــەیف و هـەوەس
چونکە ژیانی ئێســـتـەی شـــارســـتـــان
هـەرکـــــەس لێی دوور بێ نابینێ زیان
ڕۆژی کـــــاســـــبی هـەر دەس بڕینە
خـــــزم و برایی بۆ ورگـــــە شـــــینە

خـــــوێندن بۆ ناو و مـــــەئمـــــوورییەتە
نەک بۆ خـــزمـــەتی مـــوڵک و مـــیللەتە
پارەداریش بـی ئەبێ مـــــەغـــــروور بی
باشـــتـــر ئەوەیە کـــە لە شـــار دوور بی

## خەو ڕەوێنێکە

سلێمانی ١٩٤٢/١٠/٨

هەستە لە خەو کوردی هەژار
ئەی نەونەمامی ڕۆژگار
خۆت گورج کە وەک مەردی بەکار
ڕەنجێک بدە بۆ یادگار
تۆ دەمدەمی
کەمتەرخەمی
کوا مەرهەمی    زامی نیهان
با ڕاپەڕین
وەک فیل بەتین
ببیە ئەمین    بۆ نیشتمان
بەری بەیان ڕووی پڕ سروور
گزنگی خۆر هات زەرد و سوور
ڕۆژیش هەڵات پڕ شەوق و نوور
هێشتا لە خەودای پرخ و هووڕ
هەستە لە خەو
مەیکە بەشەو
ڕۆژێکی نەو    کەوتە جیهان
وەک شێری نەڕ
تۆش بێ خەتەر
ڕێ بگرەبەر    ناکەی زیان
بنوارە ڕۆژئاوا بەدڵ
بۆت کەشف ئەکەن ژێر ئاو و گڵ
وڵاتی خۆیان کرد بەگوڵ

تۆش بێ خەبەر، هەر خاو و شل
کوا ڕاپەڕین
وا سەرزەمین
بووەتە کەمین بۆ ژین و ژان
وریاییە
ئازاییە
ڕیسواییە بگری وچان
ئەم نیشتمانەی تۆ هەتە
زۆر دڵ لە داخی لەت لەتە
کانگای شتی پڕ قیمەتە
موحتاجی هەوڵ و هیممەتە
ئەی نەونەمام
کوردی برام
بیرێکە خام ژینی نەزان
بۆ ئەو کەسە
زۆر کەمدەسە
خوێندن بەسە ئەمما بەجان
بانگ کردنم پڕ حەسرەتە
بەگوێم بکە زۆر فرسەتە
خەوی جەهالەت نەگبەتە
زانین چرای سەعادەتە
شتێکە ڕوون
عیلم و فونوون
کوردی زەبوون ئەیدا نیشان
سا بێ پشوو
بخوێنن هەموو
تا زووبەزوو بێنە مەیان

## پێشکەشی نیشتمان

١٩٤٢/١٠/٢٢

فیدات بم خاکی کوردستان نموونەی جەننەتی عەدنان
لەسەر تا خوار
گوڵ و گوڵزار
دڵی غەمبار، ئەکا دەرمان، فیدات بم خاکی کوردستان
هەوارگە و دیمەنی جوانت
لە گەرمێن و لە کوێستانت
بەبێگانە
وەکو تانە
ئەڵێن گیانە، منم لوبنان، فیدات بم خاکی کوردستان
بەسەیری تۆ منی میسکین
فەرەح دێتە دڵم چین چین
لەوێ دابەش
ئەبێ بۆ لەش
وەکو ئاتەش، ئەکا جەولان، فیدات بم خاکی کوردستان
بەڵێ گوڵ خۆی کە ئەنوێنێ
بینای هەستێم ئەلەرزێنێ
بەڵام وەک تۆ
گوڵێکی نۆ
بەڕەنگ و بۆ، نییە قوربان، فیدات بم خاکی کوردستان
لە بیرمە وەک شتێ مەعلووم
مناڵ بووم عاشقی تۆ بووم
کە مامۆستام

لە ڕیز دای نام

وتی ئەی خام، بنووسە جوان، فیدات بم خاکی کوردستان

ئەویش نەبوایە باوەڕکە

گڵ و بەردت کە مووفەڕکە

ئەیانکرد کێش

دڵی پڕ ئێش

وەک ئاسنکێش، بەبێ تاوان، فیدات بم خاکی کوردستان

لەسەر من فەرزە تا مردن

لە وەسفی تۆ خەیاڵ کردن

بەشیعری جوان

وەیا پەخشان

دڵی ئینسان، بکەم حەیران، فیدات بم خاکی کوردستان

بەڵام بۆ خزمەتت گیانە

ئومێدی من بەپیاوانە

ئەوان زۆرجار

هەزاران کار

ئەکەن ڕزگار، بەبێ دامان، فیدات بم خاکی کوردستان

## ئەی پەپوولە(1)

سلێمانی ١٨/١٢/١٩٤٢

ئـەی پـەپـوولـەی هـەزاری ڕەنـگـاوڕەنـگ
بفـڕە بۆ خـۆت بەسـەر گـوڵ و چەمـەنا
لە شـەقـەی باڵ بدە بە سـەد ئاهەنگ
لـە دەرودەشـت و نـاو چـیـا و دەوەنا
چەنـدە جـوانە کـە ئەفـڕی پێـچـاو پێچ
هەر هـەناسـەی لە شـوێـنێ مـیـوانی
ڕێـی فـڕینت بڵند و خـوار و خـێچ
بێ وەی و شـادمـان و خـەندانی
خۆزگە دوو باڵی چەشنی تۆم دەسەکەوت
پێی بچـوومـایە نـاو چەمـەن بەبەیان
گوڵ زیارەت بکەم بەڕیز شـەش و حەوت
هەڵمـژم بۆن و مـاچ بکەم پەڕەیان
خـۆزگـە وەک تۆ بەتاقی تەنیـایی
ڕامـبـواردایە دوور لە خـەڵقی زەمین
جـێم چەمـەنزار ئەبوو بەشـەیدایی
بێ غـەم و دەرد و دوور لە بوغـز و قین
خـۆزگـە وەک تۆ لە گـۆشـەی دنیـا
تێ بگەیمایە چەندە سـەربەسـتی
بێ غـەم و کـەڵکەڵەی جـیـهـان و سـزا
وەکـو تۆ دوور ئەبووم لە دڵپـەسـتی
ئەی پەپوولەی هەزاری ئێـسک سـووک
تۆ بەسـەزمـان و هێـمن و مـەزڵووم

بیری گەورەت هەیە و سەرێکی بچووک
فەلسەفەی ژین لە تۆ بووە مەعلووم
ئەی مەلی بێ هەوا و کیبر و غورووڕ
بفڕە بۆ خۆت بەعەرد و ئاسمانا
بفڕە بۆ خۆت بەزەمزەمە و بەسرووڕ
کەمە هاوتات لە کوردەوەی جوانا

.................................................................

(١) مامۆستا کامەران موکریی خوالێخۆشبوو زۆر بەم شیعرە موعجەب بوو، هەرچەند یەکترمان دەدی و باسی شیعر و ئەدەبیات دەکرا چەند پارچەیەکی ئەم چامەیەی کە لەبەربوو بۆ دەخوێندەوە و ڕێزی خۆی بۆ بەختیار دەردەبڕی. (مەحموود)

# خواوەندی جوانی

١٩٤٤/٤/٣

لای خـوداوەندی شـیـرینی جـوانی
ملکەچ وەسـتـابووم بەپەرێشـانی
بەدڵی پاک و سـەری بـێ غـروور
ورد ئەبـوومـەوە لە جـوانی پڕ نوور
لەپڕ، شـەمـاڵێ هـەڵی کـرد لە من
هات دای لە هەسـتم بردی شنەشن
بۆ نـاو ئاسـمـانی بیـری بێ پـایان
فـڕاندی سـاتێ لێی نەگـرت وچان
ئێسـتـە لەوێدا کـەوتووەتە شـادی
مـەستی دڵداری و نەشـئەی ئازادی

## شیوەنی دڵ

سلێمانی ١٩٤٤/٥/٨

کە تەماشای گوڵ ئەکەم ڕۆژی بەهار
شادمان دیارە بەدەم پێ ئەکەنێ
بۆن ئەبەخشێنێ وەکو پەرچەمی یار
پاڵ بەپەستی و غەمی دنیاوە ئەنێ
وەرە بڕوانە دڵی من (گوڵەکەم)
چەندە تاریکە کە بووەتە شەوەزەنگ
وەختە ڕێ و شوێنی ژیانم هەڵە کەم
سەرزەمین هێندە لە چاوما بووە تەنگ
(دڵەکەم ڕۆییوە، ئای بۆ دڵەکەم)
بەبەهاریش نییەتی نەشئەو و دەنگ
کە تەماشای دڵ ئەکەم پڕ لە جەخار
گەشە ناکا بەتەماشای چەمەنێ
لە هەوارگە و چەم و هاوینەهاوار
تاکو بێ دەردی پەرەی لێ ئەسەنێ
خوایە چی بکەم ئەمە دەرمانی چییە
بچمە کوێ؟ کێ هەیە فریای بکەوێ
گیانە ئەی دڵ ئەمە گریانی چییە
بۆچی ئۆقرەت نییە تا نیوە شەوێ
تێ گەیشتم ئەمە ئەفغانی چییە
دیارە هەر دیدەنی دڵداری ئەوێ
بەسە ئەی دڵ خەفەت و ناڵەیی زار
شتی وەک تۆ ستەمە ڕووی بدەنێ
خۆت مەسووتێنە بەئاواتی نیگار

من مـــەفـــەوتێنە لەبۆ گــوڵبـــەدەنێ

ئەچمـــە کــونجـــێکەوە تا مـــاوە ژیان

دائەنیـشم خـەم ئەخـۆم مـات و حـەزین

سـەری خۆم کز ئەکەم و سیرڕی نیـهان

بێ تـوانجـی ئـەم و ئەو گـــــــردەنـشـین

ئەوە خــۆشــە نەوەکــوو ئەهلی زەمـــان

پێم بڵـــــێن تێک چووە نەیماوە نگین

بەخــتـیـاری ئەکـەمـە پێشکەشی یار

ڕەنجـــەڕۆییش بەشـی من بێ تـەمـــەنێ

بەکـــوڵ ئەگـــریم و ئەڵێم دیدە خـــومـــار

کوشـتـمی و کـەس نییـە تۆڵەم بسـەنێ

## سکاڵای دڵ بۆ ئەستێرەیەکی هاوڕێم[1]

بەکرەجۆ ١٩٤٤/٦/١

ئەی ئەسـتـێرەی پرشـنگدار
ڕێ نیـشــانـدەری ڕێبـــوار
عــالەم نووسـتــوو تۆ بێـدار
ئاسـمــان ئەبڕی بەشـەوگـار

دوای زەردەپـەڕ تـا گـــزنـگ
چ جـوانـی، چەشنی ئـاورنگ
ڕشـێنەی شــەوق و پرشـنگ
ئەدەی لەسەرم و سـەر سنگ

ئەی گــەوهـەری ئـاسـمــانی
سـەرچاوەی نوور و جـوانی
تـێ ئەگـــەم بەپـەنـهـــانـی
کــە ئاواڵێکی گـیــانـی

تۆ ئـەڕۆی بـەلـەنجـــــەولار
جـریوەت دێ و بـەخــتـیــار
ئــەزانــی مــنــی هـــەژار
لەنـاو خـــەم ناگـــرم قــەرار

ئەی هـاوڕێکەی شـــەوگــارم
من پـەست و شـــەو بێـدارم
گـــــوێ بگـرە لە هـاوارم
تـــێ بــگــە لــە ئـــازارم

ئەم عـەردەی تۆ ئەیبـینی
پڕ هەڵڵایە و خـودبینی
هەیە بۆ خـۆشی ژینی
تاڵان ئەکـا هاودینی

هەر هەزارە قـوڕبەسـەر
بێ باربۆ، بێ یارمـەتدەر
کەچی پیاوی خاوەن زەڕ
بێ بەزەیی، بێ خـەبەر

نەمـاون ئەو پیـاوانە
لە نەبوونی و تەنگانە
بۆ دۆست و بۆ بێگانە
خـزمـەت بکەن مـەردانە

ڕاسـتی بەڵێن و پەیمان
دریغ، چوونەوە ئاسـمـان
لای خـزم و هاوڕێی ژیان
بێ باوە و ناو و نیـشـان

لای گـەلێکی کـەم دووربین
ئێستاش خۆشە نەزانین
چونکە باسی تێکۆشین
بکەم لێم ئەکەن نەفرین

نەک شەو ڕۆژیشمان تارە
زۆرمـان بێ هۆش و کـارە
ڕووناکـیی زانین دیارە
ڕوو تێکردنی عـارە

لە ژینی وا بێزارم
بۆیە وا گرفتارم
هێندە دڵ پڕ جەخارم
مائیلی کۆچ و بارم

ئەی هاوڕێکەم دڵ پەستم
هیچ لەم عەردە ناوەستم
بۆ ئەوەی لێرە هەستم
زووکە دەس بەرە دەستم

بمبە بۆ ئاسمانی شین
بمگێڕە تا ماوە ژین
بام دووربم لەسەر زەمین
بێمە شادی و پێکەنین

خۆ ئەگەر ئەوە نابێ
تۆ شاد، با حاڵم وابێ
دوعای چاکت لای خوا بێ
بەڵکو بۆ من گیرابێ

---

(١) چەند کۆپلەیەک لەم هەڵبەستە لەلایەن هونەرمەند کاک جەلال کۆچەرەوە بەئاوازێکی تایبەتی خۆی لە ئێستگەی کوردی بەگۆرانی تۆمار کراوە.

## ئاواتی شەوێک

سلێمانی ١٩٤٤/٩/١

شـەوێک ناوجـەرگی ئاسـمـان ڕۆشـن بێ
وەک قـەڵای مـەردی دۆسـت و دوژمن بێ
ئەسـتـێـرەی ئاسـمـان بەجـریوە جـریو
پرشنگ بگرنە کـەژ و دۆڵ و شـیـو
بووکی مـانگ لە کـەل چاو هەڵبـهـێنێ
تریفـە تریف ڕووی خـۆی بنوێنێ
جـار جـار لە ناکـاو کزەی بای شـەماڵ
ببـێـتـە هاوڕێی سـایەقـەی سـامـاڵ
گـیـانلەبەر لەژێر تـارای شـەوا بێ
سـەرجـەم لە گـرمـە و پرخـەی خـەوابێ
ئـاواتم وایـە لـەگـەڵ نـازدارێ
هـەردوو یـەک بگرین لـەناو گـوڵزارێ
کـام نازدار؟ ئەوەی ئەگـەر پێی شـادبم
لە بەندی خـەم و خـەفـەت ئازادبم
وەکـو دوو دڵسـۆز هـەتـا بـەیانی
سکاڵا بکـەین بـەشـادمـانی
لەسـەر مـەخـمـەڵی گـیـا و سـەوزەڵانی
شـەونخـون کـێش بین بۆ کـامـەرانی
شـەرابمان عـەتری پەڕەی گـوڵان بێ
ساز و سـەمـتوورمـان دەنگی مـەلان بێ
مـەزەمـان مـاچی لێـوی نازدار بێ
پەرداخـمـان پیـاڵەی چاوی دڵدار بێ

لەبەردەممانا خـــــــورەی ڕووبار بێ
لە چاوی مەستی هەستیم لێ دیار بێ
ئای چەندە خـــۆشـــە لای منی هەژار
ئەو شـــەوە بۆ خـــۆم ئەژیم بەخـــتـــیـــار
ســـــەرم كـــــەڵكەڵەی ژیانی نابێ
دڵم ئارەزووی جـــیـــهـــانی نابێ
ســـــامـــــانی زۆرم نایەتە بەرچاو
بیـــرم دوور ئەبێ لە خـــەیاڵی خـــاو
سا فەلەک خۆ تۆ خۆشیت هەیە و، ئێش
هەلێکی وەهام بۆ بێنەرە پێش
با شـــەوێک لە ســـای تۆدا وەک شـــابم
تووشـــی ئاوات و بەرزی هیـــــــوابم
بەڵام ســـەد ئەفـــســـووس بۆ تۆی نالەبار
ڕەگی پیـــــاوەتیت نابزوێ یەک جـــار
کـــەواتە تەنیـــا ڕێی ڕاست و گـــوشـــاد
مـــــــردنە بمکا بەو ئاواتە شـــــاد
تا ئەوســـا گـــیـــانم لە ســــزادایە
ژینی گـــیـــان لەوێ جـــووتەی هیـــوایە

# لە کوێی ئەی شادمانی

سلێمانی ١٩٤٤/٩/٧

لە کـوێـی ئەی شـــادمـــانـی، ئەی هـیــوای بەرزی ژیانی دڵ!
لە کـوێـی ئەی تاقــە ئەســتـێــرەی بەیانی کــامــەرانی دڵ!

لە باخـــێکا هەتا چاو بڕ ئەکـــا گــــوڵ چەتری هەڵدابێ
لە ناوەندی گــولا چەند دلبــەری پڕ عـیـشــوە وەســتــابێ
بەبەزم و ڕەزمـــەوە زۆر کـــەس لەوێدا مــەست و شــەیدا بێ
کــە ئەڕوانم دڵم هەر پەســتـــە نەشــئـــەی تیــا پەیا نابێ

لە کـوێـی ئەی شـــادمـــانـی، ئەی هـیــوای بەرزی ژیانـی من!
لە کـوێـی ئەی تاقــە ئەســتـێــرەی بەیانی کــامــەرانـی من!

گـەلێ جـار وا ئەکــەومــە گـێـژەوە خــۆم ڕێ بە خــۆم نابەم
ئەڵێم با مــــەینەتی دنیـــا بەجـــامێ مـــەی لە دڵ لابەم
لە کــاتێکا کــەوا ســەرمــەســتی نۆشی ئەو مــەیی نابەم
کـــــەچی دەردی دڵم زیاتر ئەبێ، بۆ کــــوێوە، هانا بەم!

لە کـوێـی ئەی شـــادمـــانـی، ئەی هـیــوای بەرزی ژیانی دڵ!
لە کـوێـی ئەی تاقــە ئەســتـێــرەی بەیانی کــامــەرانی دڵ!

لەلای من وا بووە تا نێـــســتـــە واشی تێ ئەگــەم جــارێ
لە ســیــمــای دڵبــەران با چەشنی مــانگ بێ شــادی نابارێ
بەپارەش نایەتە بــەرهــەم لــە دڵ دەرکـــــــردنــی خـــــارێ
بەڵام گــەر بەخــتــیــار بیت شــادمــانیت دێتــە ئاقــارێ

لە کـوێـی ئەی بەخــتــیــاری، تۆی دەوای دەردی ژیانـی من!
لە کـوێـی ئەی تاقــە ئەســتـێــرەی بەیانی کــامــەرانـی من!

لەلای من بەخــــتـــیـــاری چووەتە ناو پرشنگی ئازادی
لە هــەرجێ دەرکـــەوێ نامـــێنێ بەدبەخـــتی و بێـــدادی

ئەوی بچنێتەوە پرشنگی ئازادی، برە شادی
لە دەس پەستی زەمان و زۆری بێگانە نییە دادی
لە کوێی ئەی ڕۆژی ئازادی، ئەتۆی نووری وڵاتی من!
لە کوێی چاوت هەڵێنە بۆ ژیان و بۆ حەیاتی من!
لە کوێی وا چاوەڕوانم ڕوو لە خاکی نیشتمانم کەی
بەتیشکی بەختیاریت چارەی زامی نیهانم کەی
لە قووڵکەی پەستییا ڕام کێشە، دەربەستی ژیانم کەی
هیوای دواڕۆژ و هەستی پڕ لە کەڵلە و ناخی گیانم کەی
لە کوێی ئەی عیلم و عیرفان چونکە هەرتۆی نوور و هاتی من!
دەسا چاوت هەڵێنە بۆ ژیان و بۆ نەجاتی من!

## وابزانم خەوبوو

سلێمانی ١٩٤٤/١١/١

لە بێشەلانی سەر لووتکەی شاخێ
لە شادی، هەڵمەدابوو بەیداخێ
جێیەک بوو، کۆنە ئێلاخی شاهان
ئاوەڵی هەوری بەرزی ئاسمان
ئاوی وەک چاوی قرژاڵ رووناک بوو
دەرمانی دڵی تەنگ و غەمناک بوو
بریسک و هوڕڕی هەروەک مرواری
بەنرخ بوو بەڵام کەم بوو کڕیاری
بۆنی کەنێرە و گوڵە بەڕۆنە
هەنگی کێش ئەکرد لە دوور بەو بۆنە
بەیان لە دەنگی مەلی ناو نزار
لە خەو هەڵئەستام گوێم ئەگرت زۆر جار
نە ساز و سەمتوور نە عوود و کەمان
خۆشییەکی وای نەئەدا بەگیان
بای شەماڵ فێنک ئەهات بەرەو ڕووم
زۆر بۆنی خۆشی ئەسوو لە کەپووم[١]
لە دامێنەوە چەم و چغورد بوو
ڕێبازی جاف و گۆران و کورد بوو
جگە لەوانەش کە مانگ هەڵ ئەهات
بەپرشنگی نوور ئەیکردم خەڵات
سەرم بەوێنەی قوتووی وێنەگر
ئەو دیمەنانەی ئەگرت کوتوپڕ

لەناو شـــۆراوی قـــوڵکەی چاومـــدا
ئەیشـــتنەوانیَ تا خـــۆی دەرئەدا
بەشـەو یەک بەیەک ئەیخستـە بەر چاو
شـــەویش بەوانە دڵ ئەکـــەوتە داو
لەویَ بەتەنیـا کـە دووره شـار بووم
بۆ خـۆم ئاسـووده، زۆر بەختـیـار بووم
ڕۆژێک کە ڕوانیم کچێک چوارده ساڵ
هاتە لام دانیـــشت بۆم بوو بەئاواڵ
بەقسـەی شـیرین، بەعیـشـوەداری
خستمیە گێژی دەریای دڵداری
دوو هاوڕێی دۆست و دوو یاری گیانی
کـەوتینە سـەیران بەشـادمـانی
دڵپـاک بێ کـینە لە گـوڵ ڕەنگین تر
ڕەوشتی لە خۆی زیاتر شـیرینتـر
بەشـۆخـوشـەنگی بەچاوی بادام
دڵـەی هـەژار و بێ هـۆشی بـادام
بەڵێ لەپێـشـا هەرچەند تەنیـا بووم
بەڕاستی خاوەن سـەیر و سەفا بووم
کە ئەو هات ئێجگار دڵشادی کردم
لە تـەنیـــایی ژین ئازادی کـــردم
بەشـەو دائەنیـشت لە ژوور سـەرینم
خـوا خـوام بوو نەڕوا یاری شـیرینم
بەیانێک بێ من ڕووی کــرده ناودیَ
هەر چاوەڕوان بووم بێـتـەوه لەویَ
بەڵام ڕۆژ ڕابوورد شـەوی سەختم بوو
بەشـەو هەر دەنگی پەپووی بەختم بوو

ئەگــەڕایەوە گــیـــانی شــیـــرینم
ســەری خــۆم هەڵگرت بچم بیـبـینم
ئەمــە چەند ســاڵە بۆی ســەرگــەردانم
لە کــوردســــتـــانا وێڵی شـــارانم
نازانم چووەتە کـــام دێ، کـــام هەوار
چۆن منی جێ هێــشت بەئێش و ئازار
تۆ بڵـــێی یاران بۆ جـــارێکی تر
یەک بگرینەوە هەردوو کــــــوتوپڕ
بەڵام داخـــەکـــەم خـــەتا هی ئەو بوو
نایبــینمـــەوە (وا بزانم خـــەو بوو)

(١) کەپوو: لووت.

## جەژنی قوربان

سلێمانی ١٤/١١/١٩٤٤

وا بەرە جەژنانە ئەڕوانم زەمین
بەرگی سەوز و سووری شادیی کردەبەر
کیژ و کوڕ دڵخۆش و دەم پڕ پێکەنین
هەرزەکار بۆ شایی بەستوویە کەمەر
گیانلەبەر گەورە و بچووک هەرچی ئەژین
هەستی خۆشی کردووە و کەوتووەتە فەڕ

جەژنی قوربانە، وڵات سەیرانییە
هەر بەشی من دەرد و سەرگەردانییە

وەک مەلێکی چوست و چالاکی چیا
سەردەمێ ئاسمانی شادی بوو بەجێم
بێ خەفەت ئەفڕیم، لە گەردوون دڵنیا
تا لە پڕ کۆسپێکی مەینەت هاتە ڕێم
شاپەڕی باڵی شکانم جیا جیا
ئێستە نازانم لە کوێ کەوتووم و کێم

ئەی فەلەک تۆ هەر نەوەک بۆ من وەهای
بۆ گەلی بێ دەسەڵات خاوەن سزای

جەژنی قوربانە بەڵام کوردی هەژار
جەژنی هەر نوێژکردن و نان خواردنە
هەرچی خوا فەرموویەتی نایهێننە کار
هەر لە جەژنا دوودڵی و شەڕ کردنە
چۆن دڵم خۆش بێ ئەبینم چەند هەزار
ئیشی هەر ناکۆکیی و ناوبردنە

تا وڵات جەژنی وەهابێ ساڵ بەساڵ
ئەم دڵەم جەژنان ئەبێتە کۆی زوخاڵ

## لەبەر ئاوێنە

سلێمانی ۱۹٤٤/۱۲/۳

سەر لە بەیانی کە لە خەو هەستام
بۆ خۆ ڕێکخستن کورێکی وەستام
ئیتر لە بەردەم بالا ئاوێنە
ئەکەومە گرمە بگرە و بۆم بێنە
تاوێک گیرۆدە بەریش تاشینم
دەمێک خەریکی موو هەڵپاچینم
دوای ئەوە ئەچم سەر و ڕووم ئەشۆم
سەرم دابێنم، چیم هەبێ ئەیخۆم
لەبەر ئاوێنە هێندە بەتینم
ساتێکم ئەوێ بۆ جل گۆڕینم
ئنجا کە وێنەی خۆم دێتە بەرچاو
ئەڵێم بوومەتە لاوێکی تەواو
خۆم بەخۆم ئەڵێم وابووم بەئینسان
ئەتوانم بچم بۆ گەشتی شاران
بەڵام پاش نەختێ کە ئەچمە بازاڕ
هەندێ تووش ئەبم لە ئەهلی ناوشار
هەرچەند بەسوورەت وەک من بالا نین
بەڵام بەسیرەت دڵسۆز و گیانین
ڕووخۆش و هێمن، زوبانیان شیرین
بۆ فرمانی خەڵک دەم بەپێکەنین
هەر ساتەی ئیشێک ئەگرنە ئەستۆ
کە سوودی هەبێ بۆ بێگانە و خۆ

هێندە لاوچاکن، بۆ بێ دەسەڵات
هەوڵ ئەدەن بۆیان بگەنە ئاوات
کە ئەوانەم دی دڵم دێتە جۆش
ئەچمەوە ماڵێ هەروەکو سەرخۆش
لەبەردەم بالا ئاوێنەی ناومال
ئەکەومە دەریای بێ بنی خەیاڵ
تێ ئەگەم بەرگی نهێنیم ماوە
وەکو ئەمەیان جوان رێک نەخراوە
جا بەدڵ ئەڵێم ئەی مینای گوڵگوون
تۆ بۆ من دەرخە نارێکیی دەروون
بزانم ڕاستم، یاخۆ چەوێڵم
ناشیرین، یاخۆ شیرینی خێڵم؟
وەک سەرم بۆنی ئەڕوا بیست هەنگاو
وڵات پەرستیش ئەزانی تەواو؟
وەک دەم و چاوم بریقەدارە
پرشنگی زانین لەناویا دیارە؟
وەک بەدەم ئێجگار قسەم بەسۆزە
ئامانجەکەشم پاک و پیرۆزە؟
وەک دانم سپی، لێویشم ئاڵە
مژینی خوێنی کورد لایان تاڵە؟
وەک مل هەڵپێچێ سوورە وەک خوێناو
بۆ ڕێی سەربەستیش خۆی ئەخاتە داو
وەک گوڵی یەخەم جوان و بێ گەردە
دڵیشم وایە یاخۆ پڕ دەردە؟
وەک لەپێش ئێشا جگەر خوێنینم
کە چوومە سەرئیش باشی ئەبینم

بەڵام سەد ئەفسووس هەرچەند ئەڕوانم
ئەوانەی وتم نایدا نیشانم
خۆزگە مینایەک ئەبوو پاک و ڕوون
نیشانی ئەدام نارێکیی دەروون
تا وەک خەریکی سەر و ساچاخم
کەمێک خەریک بم لەگەڵ دەماخم
لەبەر ئەو ڕێک خەم کردەی ناشیرین
بەرگێک بپۆشم سەرتاپا ڕەنگین
ئەوسا ئەمبینی هێندە لاوچاکم
لە کوردستانا کوڕێکی تاکم
ئیتر ناوێنەم بۆ ئەبوو بەدووان
ئەو بۆ ئاشکرا، ئەم لە بۆ نیهان
ئەو وەختە زۆر جوان ئەهاتمە بەرچاو
ئەگینا هێشتا ماومە ببمە لاو

## من و شوانێک(١)

سلێمانی ١٩٤٥/٢/٩

هۆ کاکی شوان! گوێم لێیە لەو بن دارە
ئەوی ئەیڵێیت نایڵێیتەوە دووبارە
بەو ئاوازەت مێگەلەکەت سەرخۆشن
سەرمەست ئەڕۆن، ئەلەوەڕێن، بەجۆشن
گۆرانییەکەت دڵداریم ئەجووڵێنێ
لەرەی دەنگت تاسەی دووریم بۆ دێنێ
خۆزگەم بەخۆت کە لە شارستان دووری
سەربەست و دڵپاک و شاد و ڕوو سووری
دیارە، پەنجەی گەردوون لە عاستت کۆڵە
بۆ خۆت جێگات نزار و شاخ و دۆڵە
بەڵام بۆ ئێمە پەنجەی وا درێژە
لەتاو دەردی سەری ئەو سەرمان گێژە
جار جار سەرمان ئەباتە ژووری ئاسمان
کەچی ناکاو ئەمانخاتە ناو زیندان
بەکەیفی خۆی ئەمانگێڕێ بەعەردا
کەس ناتوانێ، نەڕوا و شەقامی بەردا
جیهانی لێ کردووین بەکۆشکی ڕەنگین
ژیانی بۆ کردووین بەشانەی هەنگوین
هەموو لە دوویان وێڵ و سەرگەردانین
تامی تامیان ئەدا و پێ نازانین
منیش هەروا بۆ شوێن ئاواتی گوڵگوون
سەرمی جەنجاڵ کردووە خولیای گەردوون

لە بەدبەختیدا کەوتوومە کۆتەڵکۆ

لە دڵ پەستیمە وا هاتوومە لای تۆ

ئێستاش تکام ئەمەیە برای گیانی

پشوویەک بە لە ئاهەنگی گۆرانی

بەڵام ئینجا شمشاڵەکەت دەربێنە

فووی پیا کە و مامۆستایی خۆت بنوێنە

دەنگی شمشاڵ وەکو وژەی بای گوڵزار

تەفر و توونای ئەکا پەستیی دڵی زار

دەنگی شمشاڵ مۆسیقای کوردستانە

کە گوێی لێ بگرم بۆ دەردم دەرمانە

ئەی کاکی شوان ئێجگار دەروون زوخاڵم

چاوەڕێی دەنگێکی بەرزی شمشاڵم

لەو ئاهەنگەی کە مەل ڕابوەستێنێ

لافاوی شادیش بۆ هەستیم هەستێنێ

بەزمێک لێ دە، پەستیی ژیان و گەردوون

لەناو دڵما ببا، بڕوات سەرنگوون

کاکەی گیانی! توخوا وا چاوەڕوانم

قوربانت بم، زووکە منیش میوانم

---

(١) چەند کۆپلەیەک لەم هەڵبەستە لەلایەن مامۆستای خوالێخۆشبوو عەلی مەردانەوە ئاوازی بۆ دانراوە و بەدەنگی خۆی لە ئێستگەی کوردی تۆمار کراوە. (مەحموود).

## بۆ گوڵەکەم

١٩٤٥/٤/١٢

گــوڵەکـــەم، نازەنینەکـــەم
ئەی گـوڵی باخـی نیـشـتـمـان
وەرە بـڕوانـە ژینـەکـــــەم
چـۆن لـە دووریت بـووە بـەژان
بـرژە بـرژی بـرینـەکـــــەم
ڕاســتگۆییم ئەدا نیــشـــان
هـەر منم سـینە کــون کــونم
جـــەرگ و دڵ ئەنجـن ئەنجنم
وا بــەرەو ڕۆژی مـــــــردنم
وەرە نزیک ســـەرینەکـــەم

**

گیانەکەم، یاری مـەسـتـە چاو
ئێـسـتـە کـەوتووم و تل ئەخـۆم
خــەمی دووریت کــە دێت بەتاو
زۆرکەڕەت دەست لە خۆم ئەشۆم
وام لە جـــێـــدا و بێ هـەناو
خــۆم ئەزانم نەخــۆشی تۆم
هـۆش نەمـــاو، بێ ســـەروبەرم
دەنگی شین دێ لە ژوور ســەرم
دیتـنی تۆیـە دوخـــتـــەرم
بۆ نەجـــاتم لە گــیـــانەڵاو

**

شـــەو هـەتاکـــو بەری بەیان
دڵەکـــــەم پڕ لە زاریـــــە

دهنگەکەم ئێستە بێگومان

پڕ لە سۆزی هەژارییە

بۆ گوڵی ڕووت ئەکەم فوغان

دیەنیت بەختیارییە

وا بەهار هات و سەرزەمین

بووەتە تارای سەوز و شین

هەموو دڵدارێک پێک گەیین

تۆش وەرە بمکە شادمان

## گۆرانیی سەرچنار

ڕیشێن ١٩٤٥/٨/٥

ئاوەکەی سەرچنار!
چاوگەکەی نیشتمان!
لای منی دەردەدار
تۆی شیفابەخشی گیان!

یەک دڵۆپ ئاوی تۆ
گەر بگاتە دەمم
لائەبا بێ درۆ
دەستبەجێ گشت غەمم

سەیرئەکەم پڕ بەدەشت
خاوەنی چیمەنی
بۆیە هەروەک بەهەشت
گوڵشەنی دیمەنی

ئاوەکەی سەرچنار
کەوسەری سەرزەمین
تۆ دەسی کردگار
پێتی بەخشیوە ژین

هەڵقوڵە هەر بەجۆش
ڕێڕەوت گەوهەرە
ئاوی پیرۆز و خۆش
لوتفی خوات لەسەرە

تۆم هەبی پاک و ڕوون
جێگە سەیرانی عام
بۆ تەواوی دەروون
ناچمە لوبنان و شام

ئەودەمەی جار بەجار
دێمە سەیران لەلات
بانگ ئەکەم پڕ بەزار
گەیمە ئاوی حەیات

## لەناو دۆڵی مێرگەپان

سلێمانی ١٩٤٥/٦/٢٩

لەناو دۆڵی مـــێـــرگـــەپان
کـوێستـانەکـەی کـوردسـتـان
ئەڕۆیشـــتم ســـەرگـــەردان
سـەرمـەسـتی دیمەنـی جـوان

لـەم بـن دار بـۆ ئـەو بـن دار
وەک سـەر لێـشـێـواوی یار
ســەرەوژوور و سـەرەوخــوار
ئـەمکێــــــلا هـەردە و نـزار

لەم کــــانـی بۆ ئەو کــــانـی
وەک مـوغناتیـسی گـیـانی
بەهێـــزێکی ئاســـمـــانی
ڕائەکـێـشـرام پەنـهـانی

پیـرەمـەگـروونی شـیـرین
بەڕەنـد و بەفــــری زیـوین
بـریسـک و هـووڕی ڕەنگین
ئەیدا لە گــــەردوونـی شین

لەپڕ شــــەمـــــاڵی نازدار
پڕ لە بۆنی گـــیــای نزار
بۆ ســـوپاسی کـــردگـــار
ئەشـنـایەوە جـــــــاروبار

پەپوولەی جـــوان و ڕەنگین
مـــەل بەئاوازی شـــیـــرین
ڕەمــزن لەبۆ خـۆشـیـی ژین
شـــاد ئەکـــەن دڵی غـــەمگین

نیمـــەنـــی ئـــەم وڵاتـــە
کـــە کـــانگای پیت و هاتە
چاوگـــەی هـەوڵ و خـــەباتە
بەڵگەی نـەمـــــری ئـاواتە

هەی هەی لە شـــوانی ڕەبەن
چەند بەجـۆشـــە تەن بەتەن
وەک بگێـــــڕێ زەمـــــاوەن
قـــــــریوەی دێ لە بەنـدەن

جار بەجار شمشاڵی جوان
ڕووئەکـــاتە ئاســـمـــان
مـارشی سـەربەسـتـیی ژیان
لێ ئەدا بە ســـەد عـــینوان

منیش بەنەشـئـە و خـــەیاڵ
لـێـم ڕوابـــوو پـەڕ و بـاڵ
بۆ مـــاهی زەرد و ســـەر یاڵ
فـــڕکـــەم ئەکـــرد بێ ئاواڵ

ناکـــاو دەنگێکی پەنـهـــان
هەروەک ســـروشـتی یەزدان
بـانگی کـــردم (ئەی جـــوان)
خـــاس بڕوانە مـــێـرگـەبان

سەیر ئەکەم زۆر هەرزەکار
هەموو چالاک و هوشیار
لەسەر دێبەر، لە شوێن بار
هەڵئەسووڕێن بێ قەرار

ئیشکەر، کاسب، گورج وگۆڵ
لێیان هەڵماڵیوە قۆڵ
بەراو و دێم، شیو و دۆڵ
ئەکێڵن بۆ پارەی مۆڵ

ئەمبینی کاکەی جووتیار
هێند کاسبە و بەدەمار
لەسەر دەستەدووێ هەوجاڕ
چەماوەتەوە بێدار

خۆ دەستە کچی نازدار
کە جوانترن لە هی شار
هێند سەربەستن و بەکار
پۆل پۆل ئەچوون بۆ بژار

نە بەسووراو و نە سپیاو
گۆڕیویانە دەم و چاو
بەکردە و جوانیی تەواو
ئینسان ئەخەنە ناو داو

لە کوێستانی خوار و ژوور
لەگەڵ وەنەوشە و چنوور
هەر لادێیی بێ غروور
ڕائەبوێرن بەسروور

بەهەوڵ و بەڕەنجی شـــان
پەیا ئەکـــەن بەرگ و نان
هیچ کـول نابن بۆ فـرمـان
لەش سووکن و بەسـەزمـان

ئەمـویست تا ژینم مـاوە
لەو جێ خـۆشـە و سـەرئاوە
گـەر مـشـتێ پارەم داوە
زنجــێک بکەم لەو ناوە

زنجـێک جـوان و سـادەکـار
خـاڵی لە نەخش و نیگار
نەک وەکـو کـۆشکی زۆردار
بکرێ بەخـــوێنی هەژار

ئـنجـــا بـەزۆری بـازوو
خـۆم ببــوژێنمــەوە زوو
لەسـەر لەشـێکی مـاندوو
دەس بـەرم بـۆ ئـارەزوو

ئەوسا بەگـیـانێکی پاک
ئەمـتـوانی بژیم بێ باک
ئەمـتـوانی بڵـێم زۆر چاک
(سـەربەسـتم نابم بەخـاک)

# شێرە

شێراوێژە- چوارتا ١٩٤٥/١٠/٢٠

شێرە سەگێکە هی دۆستێکی من
تا بڵێی وریا و زیرەک و هێمن
هەروەک یاساوڵ شەو تا بەیانی
لەبەر دەرگایە بۆ پاسەوانی
ئیتر خاوەن ماڵ بێ خەم، بێ حەسحەس
بۆ خۆی لێی ئەنوێ و ناترسێ لە کەس
هێشتا نەمدیوە سەگی وا ئەمین
هیچ هەڵپە ناکا لەبۆ شت دزین
بام سەری تەبەق هەر بەرەڵا بێ
دەم بۆ نان نابا لەبەر لووتیا بێ
ئەبێ هاورێکەم خۆی بەشی دانێ
چونکە سپڵەیی و مووشە نازانێ
بە دوو نانی جۆ و کەمۆڵەیەک ئاو
قانیعە و هەڵمەت نابا بۆ پڵاو
هێند بەوەفایە کە بوویتە یاری
کە دیتی خۆی دێت بۆ لات بەیاری
هێشتا تووتک بوو کە منی دیبوو
منیش بەخۆشی خۆم پێ ناسیبوو
موددەتێ ڕابوورد کە دیم لێی ترسام
ئەو منی ناسی و هەڕای کرد بۆ لام
قرووسکە قرووسک هەروەک زوبان زان
تێی ئەگەیاندم جەفای لێک بڕان

ئیتر نازانم یاران چۆن حەیوان
ئەبێتە خاوەن ئەخلاقی وا جوان؟
بەڵێ هەندێکی هی مامۆستایە
بەڵام زۆریشی هەر لە خودایە
زۆری وا هەیە بەناو ئینسانە
لێی وردبیتەوە جان کوڕی جانە
ئەگەر ناودەمیان پڕکەی لە هەنگوین
لە تۆ بترازێن ئەکەونە نەفرین
بێ وەفا و سپڵە، خائین، نالەبار
کەموکووڕیی پیاو ئەبەن شاربەشار
ماڵی خزم و دۆست وەک گەزۆ و مازوو
ئەفرێنن ئەیخۆن بەزۆری بازوو
شیرازەی دۆستی لایان پساوە
کەمترین هەڵەی تۆی لەبەر چاوە
بەقسە هیچی نەهێشتووەتەوە
بەڵام بۆ کردە زوو لێبووەتەوە
دیار بێ و دیار نەبێ ئەیەوێ کە پیاو
لە هیچە کەوشی بخاتە سەرچاو
لای تێگەیشتوو سەگێکی هەژار
بەشەرەفترە لە سەد بەد کردار
هەرچەند ئەوانە وەک پیاو خوڵقاون
بەڵام تا وا بن لای من گڵاون
(شێرە) تاو توو ناکەم بەوانە
هەرچەند حەیوانە کردەوەی جوانە
ئەشێ هەرکەسێ کە وا بێ خێرە
پێی بڵێی (درێغ نابی، بەشێرە)

# بۆ بەهاری ٩٤٦

سلێمانی ١/٢/١٩٤٦

ئەرێ لە تەختی بەندەنا
بووە بەمێرغوزار
لە دۆڵ و شیو و چەمەنا
ڕەوانە جۆیبار
لە مێرگ و دەشت و گوڵشەنا
شەماڵی بێ قەرار
چییە چ باسە گوڵ ڕوان
بەدەستە چەشنی ئاهوان
بەڕاز و عیشوە و و دوان
هەموو لە دەوری شار
ئەڕۆن بەکەیف و بێ جەخار

ئەرێ مەلانی زەرد و سوور
لە بۆشیی ئاسمان
هەموو بەدەنگی پڕ سروور
بەشەو یا بەیان
چییە کە دێنەوە لە دوور
بەدەستەی بێ وچان؟
لە بن چیاوە کانیاو
بەڕەنگی شیری تازەساو
جگە لەوەی ئەدا لە چاو
لە وەرد و ناو بەیار
بەپێچ و دەورە دێتە خوار

وەلێ بەهاری نازەنین
ئەکەوتە ناو وڵات
لە ئاسمان هەتا زەمین
ئەگۆڕێ کائینات
مەل و گوڵ و دڵی حەزین
هیوا پەیا ئەکات
لە هاژەهاژی ئاوی چەم
لە پێکەنینی گوڵ بەدەم
ئەبیسترێ و ئەڵێ بەچەم
کە دەستی کردگار
بەرێکی دەرئەخا نیگار
منیش هەموو دەمێ لەلام
بەهارە فەسڵی خۆش
بەنەشئەی دڵ و غەرام
ئەکەومە عەیش و نۆش
ئەمانە خۆشە بەڵام
لەکن سەری بەهۆش
بەرامبەری جیهان و ژین
لە بۆ ئەوەی کە باش بژین
ئەبێ بەهەوڵ و ڕاپەڕین
بەرەنج و ئیشوکار
بەهار بکەین بە دوو بەهار

## یادی بیست ساڵەی ڕۆژنامەی (ژین)[1]

سلێمانی ١٩٤٦/٢/٧

(پیری ژیر) ئەی خاوەنی (ژین) و (ژیان)
ئەی یەکە دڵسۆزی خاکی نیشتمان
هەوڵ ئەدەی بەم پیرییە کوردی هەژار
سەرکەوێت و دەرکەوێت، بێتە مەیان
تۆ لە ڕێی (زانستی)یا بۆ هۆزەکەت
ناتە ئەستۆی خۆتەوە ئەرکی گران
دانەیەک ڕۆژنامەی کوردی نەبوو
ئەودەمە دەنگی (ژیان) کەوتە جیهان
دەنگ و ڕەنگێکی هەبوو پڕ سۆز و جۆش
وەک جگەر سووتاوی ژێر دەستی زەمان
هێندە دڵ پڕ کوڵ بوو بۆ ڕێی یەکیەتی
بووبووە بەیداخی بەرزی کاریان
ویستیان لەو جێگە بەرزە ڕای گرن
خۆت فڕاندت تا گەیشتە جێی ئەمان
جاری دوایی هاتەوە ئەمما چلۆن
جوان و شیرینتر لە جاران بێگومان
غایەتی هەر ناوی خۆی کردبووە (ژین)
وەرنە ئامانجی وەکو ئەو بێ زیان
پڕ لە ئەشعار، پڕ قسەی کوردایەتی
پڕ لە باسی عەنعەنەی چەرخی بەیان
پڕ لە باسی ڕاستی و دۆستایەتی
پڕ لە باسی کردەوەی شیرین و جوان

سەد سوپاس ئەمڕۆ لە چەرخی بیستەما
خۆی گەیاندە (ساڵی بیستەم) بێ وچان
(پیری ژیر) عەرزت ئەکەم تاقانەکەت
جێگەی شانازییە بۆ کورد زوبان
چاوەکانت ڕوون کە ئەمڕۆ جەژنتە
جەژنی ئەو پیرۆز و کوردیش کامەران

---

(١) ئەم هەڵبەستەی ڕووبەڕووی پیرەمێردی نەمر و گەلێک لە شاعیرانی ئەو سەردەمەی سلێمانی خوێندووەتەوە بەبۆنەی تێپەڕ بوونی بیست ساڵ بەسەر دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین)دا و، لە ژمارە ٨١٩ی شوباتی ١٩٤٦دا ئەم باسە بەدرێژی نووسراوە لەگەڵ هەڵبەستەکەدا. (مەحموود)

## لەسەر لووتکەی پیرەمەگروون

واژە، سنگێ، گردەزبێر، گۆرانگە
٦، ٧، ١٩٤٦/٧/٨

پەرییە شیرینەکەی لە چاوان گوم!!!

لە ژێر پرشنگی گەلاوێژا ئەم چەپکە گوڵە کوێستانییە دەخەمە پێش چاوت، وە بەیادی ڕۆژێک لە ڕۆژانی پێک گەیشتنمان پێشکەشی ئەو گیانە پیرۆزەی دەکەم کە هەمیشە بەئاشکرا و نهێنی، لە دوور و نزیک لە خەو و بێداریيا فریشتەی هەڵقولاندنی سەرچاوەی ئیلهاماتمە.

بەختیار زێوەر

لەسەر لووتکەی بڵندی پیرەمەگروون
کە لای من بووەتە شاخی زیو و ئاڵتوون
شەوێک دیم دوو پەریی پڕ سۆز و مەحزوون
ئەیان وت تێ بگە ئەی چەرخی گەردوون

ئەگەرچی ڕۆژهەلاتین و کەساسین
لە ڕۆژئاوایی جوانتر دوڕ شوناسین

ئەزانین یەکیەتی شێوەی برایە
دەسیسە و تەفرەدان جورم و سزایە
بەڵێنی هیچ و پووچ داوی بەلایە
ئەوەی کۆنەپەرستە بێ ڕەزایە

وەکو جاف سینە ساف و شێوە خاسین
لە ورتەی تانە و ئاژاوە کاسین

ئەزانین ئێرە خاکی نیشتمانە
ئەوی تیا دانەنیشێ خانەدانە
درشت و وردی تامەزرۆی ژیانە
هەموو دیلی و کەلەبچەی لا گرانە

بمانناسـه (براخـاس و هـەباس)ین
شـەو و ڕۆژ هۆگـری هەوجـاڕ و داسین
ئـەزانـین تـۆی نـاکـۆکـی چ ڕەنـگـه
ئەوەی بۆمـان ئەچێنێ زۆر دەبەنگە
هیوای تێکچوونی ئێمە و سەر بەجەنگە
بەڕاوێژ ئیش نەکـەین لای ئێـمـە نەنگە
لەگـەڵ دۆست و برا دڵ پڕ سـوپاسین
لەگـەڵ دوژمن لە جـەنگا بێ هەراسین
نەزانـین هـۆزی ئێـمـه زۆر هـەژارە
لە چاو هـۆزانـی غـەربا نـادیـارە
بەڵام ئـەمـڕۆ گـەلێکی زۆر بەکـارە
بەئامـانجی بڵندی بەخـتـیـارە
بەڕوو سـووری وەکـو لالە عـەباسین
لەسـەر بستێ زەوی دڵ گـەرمـە پاسین
ئەزانـین عـیلم و فـەن هۆی پێکەنینە
هـەچی هـۆزێ کـە نەیبێ بێ نگینە
بنـاغـەی پایە بەرزیی سـەرزەمـینە
نەوەک هـۆی خـاک کـڕین و خـوێن مـژینە
ئەوەی وابێ لەگـەڵیـا بێ تـەمـاسین
دەسـەو چەک ڕووبەڕوو یان بۆی مـەلاسین
ئەزانین مـەبدەئی چاکـە دیموکـرات
بەبێ ئەو مـەبدەئە ناگـەینە ئاوات
دیموکـرات جـوانتـرە بگرە هـەزار قـات
لە ئیستیعمـار و فاشیستی خـەرافات
بەڵێ بۆ هەر شـتێ خـاوەن ئەسـاسین
لەبەر بووکی ولاتیـشـا کـراسین

بەڕاستی ئەم قسانە دڵمی جووڵان
کە ڕوانیم لای نەدیوی پشتی ئەکوان
بەشێکی زۆر فریشتەی پاکی یەزدان
بەئالایەکەوە هاتن بەگریان

بەوانیشیان ئەوت زۆر بێ قیاسین
مەترسن پشتی ئێوە و ئێوە ناسین

بەدڵ هەستام بچم بۆ لای ئەوانە
بەڵام خەو، ئەو قولی ئێسک گرانە
وەهای بادام کە سەیرم کرد بەیانە
منیش هێندەم لە گوفتاریان ڕەوانە

لە ناپاک وایە کوردی بێ حەواسین
بەڵام لای پاک جەوان مەرد و بەباسین

# بەهەشتێکی گوم بوو

سلێمانی ١٩٤٦/٨/١٩

گیانەکەم: هاوڕێی ژیانم! نازەنین
کوا لە کوێی؟ دڵ بووەتە کانی ئاگرین
بێرەوە، وا لەشکری دەرد و جەخار
جێی بەمن لێژ کردووە ئەمڕۆ بەقین
بێرەوە، وا کۆشکی شادیم دەم بەدەم
وردە وردە ڕووئەچێ بۆ ژێر زەمین
بێرەوە، هەرچەند ئەزانم دیدەنیت
ئەم دڵە ناخاتەوە سەر پێکەنین
وا زەمان ئەمڕۆ بەپەنجەی نەگبەتی
جەرگی کون کردم وەکو دێوی لەعین
ئەو بەهەشتەی کیژ و کوڕ ڕووی تێ ئەکرد
بۆ ئەوەی هاوین بەخۆشی تیا بژین
دڵ ئەڵێ یادێکی ڕابووردووی بکەین
یادی پێنجوین دڵ ئەخاتە سەر فڕین
دێتەوە یادت چ خۆش بوو دیمەنی
بەرز و شیرین هەروەکو خولدی بەرین
دێتەوە یادت هەوای (چوارباخ)ەکەی
چۆن دەوایەک بوو لەبۆ قەلبی حەزین
دێتەوە یادت چ خۆش بوو ئاوەکەی
سارد و شیرین هەروەکو ئەسکەنجەبین
دێتەوە یادت نزار و شیوەڵی
پڕ لە مەل بوو، پڕ گوڵاڵە و یاسەمین
دێتەوە یادت بەشەو لەو خاکەدا

چۆن لەگەڵ شادی ئەچووینە ناو کەمین
دێتەوە یادت بەرۆژ هەر کوێ ئەچووین
چەپڵەڕێزان بوو، زەماوەن، هەڵپەڕین
چەندە خۆش بوو لەو کەلانە دەنگی مەل
ڕووی ئەکردە سەر زەوی و ئاسمانی شین
ئای چ خۆشمان ڕابوارد ئەو موددەتەی
شاری پێنجوینمان ئەکردە جێنشین
هەر پەنا شاخێک ئەچووین دەنگی ژیان
گوێی دڵی سەرمەست ئەکردین چین بەچین
هەر مرۆڤێکمان ئەدی هەستێکی پاک
کوردپەرستی زیاد ئەکردین زۆر بەتین
هەر سەراوێکی ئەچووین نەشئەی وڵات
ئەم دڵەی ئێمەی ئەخستە ڕاچەنین
هەر گوڵستانێکی ڕوومان تێ ئەکرد
کەڵکەڵەی عەشقی ئەخستینە فڕین
نازەنین، دەستی شکاوم داخەکەم
ئێستە (پێنجوین) دڵ ئەخاتە سەر گرین
ئەو تەلارانەی کە ئەت دی بەرز و خۆش
ڕۆچووە و بووەتە کەلاوەی نائەمین
ئەو چەمەنزارەی هەوارگەی ئێمە بوو
وا پەپوو تیایا ئەخوێنی پڕ بەبین
ئەو سروور و شادییەی لەو جێیە بوو
ئێستە بووەتە باوکەڕۆ و هاوار و شین
ئەو مرۆڤانەی لەوێ بوون شادمان
ئاوەکی کەوتوون و بێ بەخت و نگین

بەم بەرە جەژنانە، ماڵوێران، هەژار
نا بەدڵ، ناچار، هەموویان دەرپەڕین
بوومەلەرزە وای سەرەوژێر کردووە
بگرە قەت نابێتەوە مەڵبەندی ژین
بابچین توخوا بەرامبەر جێگەکەی
تێروپڕ بگرین بەجەرگی پڕ برین
بابچین چونکە بەهەشتی ئێمە بوو
شێوەنێکی بۆ بگێڕین ماتەمین
بابچین بۆ دڵنەوایی ئەهلەکەی
ڕووبکەینە کوردی پڕ عەزم و بەقین
یەک بەیەک پێیان بڵێین: دڵسۆزەکان
ئەم برایانە بەناموسن بەدین
وا فەلەک دووچاری کردن قەت نەکەن
زوو فەرامۆشیان بکەن، بێگانە نین
ئەم برایانە هەموو دەستی قەدەر
ناو دڵی توێ کردن و جەرگی برین
بێنەوە بۆ کۆمەکی و باربۆی ئەوان
ناو تەلار و ناودەوار و زنج بچین
بۆ هەموویان یارمەتێکی وا بدەین
جەرگیان ساڕێژ بکا وەک پەنسلین
سا بەقوربانی هەمووتان بم بەدڵ
ڕۆژی باربۆیانە با ڕوو سوور ببین

پێنجوێن

بەهەشتێکی وون بو

بەهەشتێکی وون بو

بەختیار زیور

بەختیار زیور

٢-٩-١٩٤٦

٢-٩-١٩٤٦

**دەربارەی ئەم هەڵبەستە چەند وشەیەک:**

لە ساڵی ١٩٤٥و١٩٤٦دا شاری پێنجوین دووچاری بوومەلەرزەیەکی زۆر هات، ناچار زۆربەی دانیشتوانی بەجێیان هێشت و ئاوارەکەوتن. لە هەموو لایەکەوە دەستی یارمەتی و باربۆیان بۆ درێژ دەکرا.

لاوانی ئەوسای شاری سلێمانی هەستان بەپێشکەشکردنی چیرۆکی شانۆیی

(گوڵی خوێناوی) له نووسینی شاعیری نه‌مری کورد مامۆستا گۆران که له حه‌وشه‌ی قوتابخانه‌ی گۆیژه‌ی سه‌ره‌تایی کوڕان پێشکه‌ش کرا و سووده‌که‌ی بۆ لێقه‌وماوانی بوومه‌له‌رزه‌ی پێنجوین بوو. به‌ختیاریش به‌م هه‌ڵبه‌سته هاوبه‌شیی کرد که بوو به‌وته‌ی پێشه‌کی. مامۆستا ڕه‌فیق چالاک بۆی گێڕامه‌وه ده‌یوت به‌جۆرێک هه‌ڵبه‌سته‌که‌م ده‌خوێنده‌وه هه‌موو دانیشتوانم ده‌هێنایه جۆش.

هه‌روه‌ها دکتۆر عیزه‌دین مسته‌فا ڕه‌سوولیش بۆی گێڕامه‌وه و وتی شه‌وێک له‌کاتی خوێندنه‌وه‌ی هه‌ڵبه‌سته‌که‌ی به‌ختیاردا که خۆی له‌وێ دانیشتبوو، ئه‌وه‌نده کاری کرد، مامۆستای شاعیر ئه‌خۆل ناچار لێی پرسی به‌ختیار ئه‌مه هی خۆته یان هی وه‌ستاته؟ مانای باوکته، ئه‌ویش له وه‌ڵامدا وتی هی خۆمه و له دواییدا به‌نامیلکه‌ش چاپ کرا و سووده‌که‌ی هه‌ر بۆ لێقه‌وماوان بوو.

مه‌حموود

***

# شەوگاری دڵداری

سلێمانی ٢/١١/١٩٤٦

دیسانەوە شەو هاتەوە بۆ عاشقی غەمبار
بتلێتەوە تا ڕۆژ بەجەخاری دڵی زامار
بێچارە بناڵێنێ وەکو بولبولی گوڵزار
پڕ سۆز و بەئازار، ناکام و بەبێ یار

هەرچەندە وەک ئەستێرە شوناسێکی جیهانی
ئەڕوانمە ئاسمانی هیوای پڕ لە نیهانی
لێم دیار نییە بەختی منی بیمار
هەی هەی کە منی زار، بەدبەختم و بێدار

شەوگار دە بڕۆ ڕەش لادە لە چاوم
من خۆم بەگەلێ دەردەوە باش تێوە گلاوم
تۆش هەروەکو مێمڵ مەبەرە ڕێگری دیدار
بەس بمخەرە هاوار، دڵ پەستم و دووچار

گوێم لێیە نزیک دەنگی نەی و عوود و سەمایە
بەزم و چەقەنە و بستە و بەستەی لەگەڵایە
ئەو شادییە لای من بووەتە شیوەنی شەوگار
بێ دیدەنی دڵدار شادی نییە یەکجار

ئەی دڵ کەمەکێ ئۆقرە ئەگەر بگری بەیانە
ڕۆژ بێتەوە گوڵزاری هیوای پڕ لە ژیانە
لەم تاسە و ناکامییەی ئەمشەو ئەبی ڕزگار
دەروازەیی ئەسرار، ئەکرێتەوە ئەوجار

## پایزی زستانی

سلێمانی ٢١/١٢/١٩٤٦

١

وا گەڵارێزانە گیانە! بۆ چەمەنزار
هاژە هاژی بای خەزانە ڕووبەڕووی شار
ئەو درەختانەی کە سەریان زۆر بڵندە
ئەو گوڵانەی ڕەنگ و بۆیان زۆر پەسەندە
ئەو مەلانەی جێگەیان کا و سەهەندە
هاتنی پایز لەبەر دڵیان گرانە
چونکە توندی و گرژ و مۆنی پڕ جیهانە

٢

بایەکەی پایز بەجارێ دێتە سەرمان
خۆڵ و پووش دێنێتە خوارێ بۆ گوزەرمان
پۆتەڵاکی دار ئەژاکێنێ بەیەکجار
ڕووی گوڵان زەرد هەڵئەگێڕێ وەک ستەمکار
شادمانیی مەل ئەخاتە ناو دڵی غار
چنگ لە هەرچی گیر بکا مانی نەمانە
بەم کزە ساردەی نیازی پڕ زیانە

٣

هەر کە پایز بێ سەروشوێن ڕۆی لەبەر چاو
لەشکری زستانی پڕ قین دێن بەپڕتاو
هێزی وەیشوومەی لەژوور سەرمان ئەوەستێ
هاتوچۆی پێدەشت و سەربەندەن ئەبەستێ
چین بەچین ئەم ناوە بەفری تێ ئەپەستێ

تیـشکی ڕۆژ ئەشکێـتـەوە گـەرمـی نیـهـانە
ڕۆژی گـــــورجـی و ڕێ بڕیـن و پـێ لـێ نـانـە

٤

بەفـری زسـتـان تۆفی پایز     توند و پڕ هـێـز
بۆ وڵاتـی کــــوردی ئـازیز     ئەچنـە پارێز
شـاخـەکانمان ئەبنـە کۆگـای بەفری ئەستوور
ئاوی ڕووبارمـان کە دێت وەک ئەرخـەوان سوور
نیـشـتـمـانی کـوردەواری، خـوار هـەتا ژوور
تۆف و بـەفـر و بـا، لەلامـان خـۆش و جـوانە
چونکە کـوێسـتـانین و ڕەمـزی نیـشـتـمـانە

٥

پـایزی زەرد با بـەعـــینوان     کــــاری وا بـێ
بگرە لامـان خـۆشـە زسـتـان     بـەفـر و با بێ
ئەو کەسەی سـەرسـامـە لێمـان          دڵنیـا بێ
جـەسـتـە خـۆشـەی مـەینەت و دڵ هەڵکزاوین
بـەم کـەژ و کـێـوانە سـەربـەرزی تەواوین
بۆ سـەر و ژوور کـەی هـیـوا خـێـچکە بـەتاوین
بەفـر و با ڕێـی ئێـمـە ناگـرێ تـاکـو مـاوین
چونکە هـەوڵـی ئێـــمـــە بۆ بـەرزیـی ژیـانـە
چوست و خـوێن گـەرمـین و دڵمـان شـادمـانـە
تـیــر ببــارێ کــردوکــۆشــمــان بـێ وچانـە

## مامۆستای دڵسۆز

سلێمانی ١٩٤٧/٢/٢٦

مامۆستا خۆشەویستەکەم!! مامۆستای شاعیرم

لەگەڵ پۆستەی گەلاوێژا بەیادی ئەو دەرسە بەنرخانەی کە ٢٢ ساڵ لەمەوبەر لە کونجێکدا بەنهێنی پێت دەوتم، ئەم شیعرانەت پێشکەش دەکەم. ئێستاش وەنەبێ من شانازی پێوە بکەم و بڵێم دیارییەکی بێ وێنەیە، بەڵکو تەنیا لەبەر ئەوە بەخۆم هەست دەکەم کە تا چ ڕادەیەک بۆنی ئەو چەپکە گوڵانەی لێ دێت کە تۆ ئەوسا لە دەمت دەکەوتە خوارێ لەلام، ئەو دەمەش خۆم بە بەختیار دەزانم چاو لە هەڵەکانم بپۆشی و پێ بزانی ئەمە دیارییە و گوڵاوی نییە لە کن من.

مامۆستا گیان تۆ لای من زۆر پیرۆزی<br>
تۆ، لە باوکم زیاتر بۆ من دڵسۆزی<br>
جوان هەست ئەکەم بەزوبانێکی شیرین<br>
پێم ئەبەخشی زانستی خۆت چین بەچین<br>
هێزی دڵ و دەماغت هێندە بەرزە<br>
وتارەکەت هەستیم دێنێتە لەرزە<br>
تۆ بەبیری ڕووناک ڕێگەی ژیانم<br>
ڕۆشن ئەکەی، چەوتیم ئەدەی نیشانم<br>
ئاگام لێیە بەباسی کرداری جوان<br>
ئەمخەیتە سەر شەقامی ڕاست و ڕەوان<br>
زۆر حەز ئەکەی وەک دانیشتووی ڕۆژئاوا<br>
خۆم و هۆزم بەرزبینەوە بێ داوا<br>
لە مەیدانی ژیانا سەربەخۆبین<br>
زانا و هوشیار، لەگەڵ یەک بێ درۆبین

مامۆستا گیان تۆ پێشەوای جوانانی

چرای ڕووناکیی خاکی کوردستانی

لە نیشتمانا سەرکردەی زانستیت

بنچینە دانەری قەڵای سەربەستیت

بەڵام سەد ئاخ، ئەوەمان ناتەواوە

لای کورد هێشتا قەدرت باش نەزانراوە

ئەمجا تۆش گەورەم چونکە ئێجگار ژیری

لام وایە لەم حاڵە کەمێ دڵگیری

باوەڕ ناکەم ئەوەش عەزمت بشکێنێ

دانا هیچ کاتێک عەزمی نانەوێنێ

ڕۆژێک ئەبێ قەدرت بگرن بەچاوان

لەبەر دەمتا بوەستن تیپی لاوان

هەیکەلێکت بۆ بکەن گشتی ئاڵتوون

گوڵبارانی بکەن بەشەوقی دەروون

هیوای من و تۆ ئەوسا دێتە مەیدان

کوڕنووش بەرن بۆ هەیکەلت پیر و جوان[١]

---

(١) لەگەڵ ئەم هەموو ڕێز و سەنایەدا بۆ مامۆستا و زانست کە باوەڕ ناکەم تا ئەو سەردەمەی ئەم هەڵبەستەی تیا وتراوە و بەڵکو تا ئێستاش هیچ شاعیرێک ڕێزی بەم جۆرە لە مامۆستا گرتبێ، هێشتا بەختیار زێوەر قوتابخانەیەکی بەناوەوە نییە؟ (مەحموود)

## وتاری کوردێک

١٩٤٧/٨/٢١

بام ڕۆژانەکـــەم یەک دوو قـــڕان بێ
خـــواردنم وەکـــو ســـەپان و شـــوان بێ
با لـەشـم ڕووت و دەردم گـــــــران بێ
بـەڵام تا مـــــردن بێ درۆ کـــــردن
عـەشـقی نیشـتمـان، دەرناکـەم لە گیـان
بام بۆ زۆرداران بچـــەوســـێـــمـــەوە
با لە بێگاریان نەحـــەســـێـــمـــەوە
شـــپـــرزە نابم هەڵ ئەســـێـــمـــەوە
چونکە تا مـــردن، بێ درۆ کـــردن
بـــەرزیـــی وڵاتم، بـــۆتـــە ئـــاواتم
هەرچەند جێگەی خەڵق کۆشک و تەلار بێ
جـێی منیش قـۆخـتـە و زنج و دەوار بێ
بەڵام پێـویسـتـە کـە شـوێنم دیار بێ
بەبوون و نەبوون، بەپەســتـیی گـەردوون
لە خـــزمـــەت کـــردن نابم تا مـــردن
بەقـــســـە و نووسـین، بەدەست و زوبان
هـەوڵ ئەدەم کـــوردی نەبەردی زەمـــان
بخـــەمـــە ســـەر ڕێی بڵندی ژیان
هـەتا کـــورد زوبان، لە خـــۆشـــیی ژیان
بێ بـەهـرە نـەبن، چ پیــــاو و چ ژن
ئەمـــــەوێ عـــــالـەم تێ بگەیێنم
بیـــری نوێ لەناو کـــوردا ئەچێنم
ڕەگی بیـــری کـــۆن لەبن دەردێنم

دەسیسەی ناپاک، ئەنێمە ژێر خاک
ئاواتی دوژمن، دەردێنم لەبن
نامەوێ بژی کۆنەپەرستی
ئاو ئەدەم بەخوێن گوڵی سەربەستی
پێم قووت نادرێ دیلی و ژێر دەستی
بەدەنگی دلێر وەکو بێچووە شێر
هاوار ئەکەم من، بڕووخێ دوژمن
بەڵام پێویستە ئاوەڵەکانم
بەکوڵ ئەوانیش شان بەنە شانم
بۆ بەرزیی کورد و بۆ کوردستانم
هەتا پیر و جوان، یەکدڵ، یەکزوبان
بەختی نەکەین خۆ، نابین سەربەخۆ

## بەستەی جووتیار

سلێمانی ١٩٤٧/١٢/٩

ئەم زنجەی خۆم ناگۆڕمەوە بەتەلار
نان و دۆی خۆم نادەم بەخوانی زۆردار
داسی خۆم نانێم لە گەردنی هەژار
هێزی شان و قۆڵم نادەم بەبێگار

من سەربەستم، ئیش بەدەستم، زۆر بەکار
من جووتیارم، من جووتیارم، من جووتیار

کێڵگەی وڵات بۆ میر و بەگ ناکێڵم
بشمکوژن زەویی خۆم جێ ناهێڵم
تۆ ئەوەشێنم، ئاڵتوونە شوێن هێڵم
زۆردار واز دێنێ و بسکەی دێ سمێڵم

گەنم و جۆی خۆم نادەم بیکەن بەعەمار
گرانی پێ ساز بکەن سەرمایەدار

بێ خەم ئەبم لەو خاوەنی سامانە
بووژانەوەی ئێمەی لەلا گرانە
لەسەر رەنجی ئێمەش خاوەن دیوانە
حەقی ئەو نەوعە کوشتن و زیندانە

چونکە چاوبرسی و خوێنمژە و نالەبار
لەسەر شانی گەلی هەژار بووتە بار

ئەو رۆژە رووناەی گشت گەلی کوردستان
بۆ هەقی خوراو سەرجەم دێنە هەستان
لەبن دێتە دەر فێڵی پوول پەرستان
کلکە قنگەی بێگانەش دێتە وەستان

کورد پێ ئەگا بۆ خۆی ئەبێتە سەردار
لە چەرمەسەری ژیان ئەبێ رزگار

## میللەتێک

سلێمانی ١٩٤٨/٢/٩

مـــیللەتێک هیـــوای بەرزیی ژیان بێ

تینووی ئازادی و دیلی زەمـــــان بێ

بەندی و هەژاریی زۆر لا گـــران بێ

هێـــزی مـــەردانەی کـــە هاتە گـەردش

وەک ئەتۆم زەمین دێنێـــتە جـــونبـوش

مـــیللەتێک زۆربەی نەخـــوێندەوار بێ

چەوســاوەی دەستی ســەرمایەدار بێ

جـــەرگ هەڵکزاوی ئاگـــری زۆردار بێ

کـــە جـــوولایەوە وا خـــۆی ئەنوێنێ

کـــە تۆڵەی ڕۆژی ڕەشی بســـتـێنێ

میللەتێک مێژووی ڕووناک و جوان بێ

ئەولای ئـەردەڵان ئـەم لای بـۆتـان بـێ

کـانگای ئاڵتـوون و نەوت و سـامـان بێ

هیچ هێـزێک نیـیـە ڕێی ببـاتە بەست

بەزانست و فـەنن خۆی ئەکا سـەربەست

مـــیللەتێک چاوی لە خـــەو هەڵهـێنێ

ببـــــــینێ دوژمـن زۆری بـۆ دێـنـێ

ســـتـــەمـــە ســـەری بۆ دانەوێنێ

بێگومـــان ژیان لە خـــۆی تاڵ ئەکـــا

تـا لاشـــەی دوژمن لەناو چاڵ ئەکـــا

مـــیللەتێک نەوەی کـــاوەی ئازا بێ

بۆ سەرکەوتنی خۆی دڵنیا بێ
بۆ ژیانیشی دڵ پڕ هیوا بێ
زۆری پێ ناچێ ئەگاتە ئاوات
ئاڵای سەربەستی بەخوێن هەڵ ئەکات

## نەورۆزی ١٩٤٨

سلێمانی ١٩٤٨/٣/٢١

بڕوانە ئاسمانی شین
بڕوانە دەشتی ڕەنگین
بڕوانە گوڵ و نەسرین
بەهەشتێکی زۆر شیرین

ئەڵێن ئەمڕۆ بەهارە
وڵات بووکی نازدارە
ڕازاوەی کردگارە
دڵخۆشیمان لێ دیارە

بڕوانە لاوانی ژیر
یەکدڵ وەک حەلقەی زنجیر
ڕۆڵەی نیشتمانی پیر
بەبەرزیی وڵات هاوبیر

ڕوو لە دەشت و سەیرانن
دڵخۆش و شادمانن
چونکە گەنجی مەیدانن
ئەمڕۆ بەجەژن ئەزانن

کیژۆڵەکانی نازدار
خانمۆڵەی شیرین کردار
چاوەڕوان بوون کە بەهار
لەسەر بەندەن بێنە خوار

بەڵام سوپاس بۆ یەزدان
نەورۆزی دیسان ڕەخسان
ئێمەش ئەیکەین بەسەیران
بۆ کورد و بۆ کوردستان

# گریمان

سلێمانی ١٩٤٨/٤/١٧

گــــــــريمـان پـارەت هـەزار كلـوور بـێ
شـەو لە ژوور سـەرت سـاز و سـەمـتوور بێ
بـەڕۆژ ديوانـت پڕ زەرد و ســــــوور بـێ
هـاوڕێـی ژيانت بـەگ و مــــەئمــــوور بێ
گيـانەكـەم ئەگـەر خـۆت بێ قـيـمـەت بی
نرخـــێكی نيــيــە خــاوەن ســــەروەت بی
گـــريمـان ئەمـــڕۆ مــــەردی مــــەيدان بی
خــــــاوەنـی نـان و خــــــوانـی ديوان بی
پيـــاوێكی بۆشـنـاخ زۆر قــــســــەزان بی
شـــارەزای قـــانوون، شـــيـــرين زوبان بی
ئـەگــــــــــەر دەروونـت پـاک نـەبێ تـەواو
ئـەمــــانـە هـەســـتـــيـت نـاگــــۆڕن تـەواو
گـــــــريمان هـەمـــــــوو ئـەوروپـا چـووبی
گــــەلێک ڕەوشت و زانـين فــێـــربووبی
بەوردبـوونـەوە وەک ئـەرەســـــــتــــوو بی
بــــەدەم بــــۆ ولات پــــڕ ئــــارەزوو بــــی
كە قازانجی خۆت پێش خست لە هی گەل
ئـەزانـرێ دزی و ئـەگـــــــــەڕێی بـۆ هـەل
گـــــريمان كــــاسب يـا دووكــــاندار بی
خــــەريكی ســــەودا و جــــوابی كــــڕيار بی
بـــــەديمـــــەن چـاک و پــــاک و هـــــەژاربی
بۆ نـوێژ و ڕۆژوو ئـێـــجـگار بـەكــــار بی

ئەگـەر کـەوتیـتــە فـێڵ و دەس بڕین
لە تـۆ چاکــــتــــرە ڕێگری بـێ دین
گـیـانەکـەم هەرکـەس ڕاست و ڕەوان بێ
بەکـــردار دەرخـــا نیـــازی جـــوان بێ
دڵســـۆزی مـن و تۆ و نیــشــتــمــان بێ
حــەز ئەکـا کـوڕی سـەپان و شــوان بێ
ئەو کـــەســـە ڕۆڵەی کـــوردی هـەژارە
بـا تـۆش نـەیـنـاسـی وەکـــــو ڕۆژ دیـارە

## بۆ قەرانەتی کوردیی منداڵان

سلێمانی ١٩٤٨/٩/٣

تا پێ ئەگەم ئەخوێنم
واز لە خوێندن ناهێنم
خوێندنە چرای ژینم
بۆ خۆ و دوژمن ناسینم
بۆ دوا ڕۆژی ڕووناکم
ئەبێتە هاوڕێی چاکم
خوێندەواران بەڕێزن
گورج و تێر و بەهێزن
بەرامبەر چەرخی گەردوون
هەیانە بازنی ئاڵتوون
هۆزێکی نەخوێندەوار
هەرگیز نازی بەختیار
چونکە بێگانەی زۆرزان
لەپڕ لێی دێتە مەیدان
هەر بەبێگار ئەیکوژێ
خوێنی لەشی ئەمژێ
دەغڵودانی ئەفڕێنێ
ئەیبا خۆی پێ ئەژێنێ
بام ئەو هۆزەش ڕیسوا بێ
هیچ بەتەنگەوە نابێ
ئینجا هەتا بمێنم
تێ ئەکۆشم ئەخوێنم

دوا ڕۆژ وەک ڕۆڵەی دڵسـۆز
ئەبمە پشـتـیـوانی هـۆز
بۆ سـەربەسـتیی کوردسـتان
بەخـتی ئەکەم مـاڵ و گیـان

## گوڵی سەربەستی[1]

سلێمانی ٣٠/١٠/١٩٤٨

گوڵێک شیرینتر لە خونچەی بەهار
نازکتر، جوانتر، لە شەوبۆی نازدار
گەشتر لە دیدەی وەنەوشەی نزار
گوڵێکە ناوی گوڵی سەربەستی
مەردە ئەو گەلەی بگاتە دەستی
گوڵی سەربەستی ئەی هێزی گیانم
ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی ژیانم
تۆم نەبێ! من خۆم بەهیچ نازانم
تۆم نەبی هەرگیز ناحەسێمەوە
بێ بۆنی خۆشت نابووژێمەوە
بام تەنیا هەر تۆ شاگوڵی من بی
سەرچاوەی سۆزی بەکوڵی من بی
تۆ، تاقە یاری پڕ دڵی من بی
شیعرت پیا هەڵدەم بەزوبانی خۆم
بڵێم دەمێکە بەدڵ شەیدای تۆم
بۆچی؟ ڕەنگی تۆ وەکو خوێن سوورە
هەر هۆزێ کە تۆی تیابێ جەسوورە
وڵات بەبۆنت زۆر پشت ئەستوورە
دیارە تەلیسمی بەرزی ژیانی
گەلێک کێش ئەکەی بۆ کامەرانی
بەڵام نرخی تۆ ئێجگار گرانە
کڕیارت کوشتە و جێگەی زیندانە
بۆ تۆ من خوێنی خۆم لا هەرزانە

سەرم بەخت ئەکەم تۆی پێ ئەسێنم

کە تۆم دەسکەوتی سەربەرز ئەنوێنم

یاران ببینن ئەم کەژ و دەشتە

ئەم لالەزارە کە وەک بەهەشتە

حەیفە ولاتمان کە جێگەی گەشتە

ئەو گوڵە خونچەی تیا نەکاتەوە

کوردیش گرەوی خۆی ناباتەوە[٢]

............................................................

(١) ئەم هەڵبەستە مامۆستای خوالێخۆشبوو هونەرمەند تایەر تۆفیق لە ئێستگەی کوردی بەغدا تۆماری کردووە. ناوبراو هەروەها هەموو هەڵبەستی گۆرانییەکانی خۆی کۆکردووەتەوە و لەژێر ناوی گوڵی سەربەستیدا لە چاپی داوە.

(٢) هونەرمەند و دەنگخۆشی خەڵکی سلێمانی عەبدولقادر حوسێن کە ناسراوە بەکاک قادری حاجی حوسێنی نانەوا لە ئاهەنگەکانی نەورۆزی شاری سلێمانی ساڵانی ١٩٥٨دا بەگۆرانی ئەم هەڵبەستەی ئەوت لە شوێنە گشتییەکان. (مەحموود)

## بەشوێن سامان

١٩٥٠/٩/٢

ئـەی درهــەم و ئـەی دیـنـار
تـاقــانـەی کــۆشک و تـەلار
هـێـــــزی بـەردڵـی هــەژار
شــەمـامــەی یار و ئـەغـیـار
هەڵسـووڕانی ئیش و کـار
لە خــــۆتـان دێ بـێ ئازار
شــیــرینیی ئێــوەی نازدار
کــێــوی دێنێــتــە ژێر بار
من ناڵێم دووســـەد هـەزار
بەڵام دیـنـاری شـــــینکار
کە ڕووی تێ کردی یەکجار
ئـەتـبــــــا دیـارە و دیـار
ئینســــــانێکی نالـەبار
هـیـچ نـەزان و بـێ دەمــــار
هەروەک ئەفـەندیی ناوشـار
بۆت ئەکـــا بەخــوێندەوار
هـەر پارەیە بێ شـــومـــار
ئەیبـەخشن مـیـر و توجـار
بـۆ ژیانـی بـێ غــــــوبار
قـــــەڵایەکــــە پڕ نیگار
دوژمـنـێکـی هـەرزەکــــار
کـــــە ژیـنـت لـێ بکـا تار

بۆی بەرە وەکــو ســـەردار

ئیـــتـر ئەژیت بەخــتــیـار

ئەی دەوڵەمــــەندی ناودار

پێـی ڕابوێـرە بەویـقـــــار

بەڵام وریابە جــار جـــار

لای خـوا نەتکا شـەرمـەزار

ئەی گـەنجی لە گـیان بێـزار

ژیر بە و بەهـۆش و بەکـــار

یارەی خــزم و کــەسـوکـار

نەتبــا بۆ کــۆڕی قــومــار

ئەی (بەخــتـیـار)ی لاسـار

لای زۆربەی خـــاوەن ئەفکار

ئـەمــــــــڕۆ پـاوەن و دۆلار

بوونـە سـەرچاوەی ئـەســرار

## ئەی فیداکارانی میللەت[1]

ئەی فـــیـــداکـــارانی مـــیللەت، شـــێـــر مـــەردانی وڵات
ئەی ڕەئیـــســـانی دیانەت، ســـاحـــێـــبی ســـەوم و ســـەڵات
بۆ نیـــســـاری بێ وجـــوودە لیـــرەو و ڕوپیـــە و مـــەنات
(ڕوو لە خواکەین بۆ [مەلیک] داویە لەدەس زیللەت نەجات)[2]
(کەس نەبێ چاوی لە ڕوتبەی، خزمەتی کەین بێ خەڵات)

**

تاکـــو دوێنێ بوو لە مـــەیدانا ئەتانوت ئێـــمـــە جـــووین
سەیری ئەمڕۆ کەن هەموو سەربەست و ساحێب ئابڕووین
وا لە بادەی یەکیـەتی سـەرمـەستی فیکری هاتوهـووین
(گشت فیداکاری [ئەو]ە ئێستاکە وا سەربەست کە بووین)
(ناوی تەئریخی لەجـێی ڕوتبـــەی فـــەریقی بێ لەلات)

**

گەر نەکەین ئیسپاتی مەوجوودییەت ئەمڕۆ ئێمە چین
پشـتـیـوانێکمـان هەیە وەک کـێـوی ئاسن وا مـــەتین
من کـــە فـــەردێکم لە کـــورد بڕوا بکەن ئەی مـــوسلمین
(خـــزمـــەتی مـــیللەت لەلام فـــەرزە بەتەســـدیق و یەقین)
(نەک بەدەم، یاخـــۆ زوبان، بیللاهی وامـــە تا مـــەمـــات)

**

خـــاکی کـــوردســـتـــان مـــەحـــەلی عـــیلم و دارولفـــەن ئەبێ
مـــەوقـــیـــعی ئەهلی کـــەمـــال و بۆ هونەر مـــەسکەن ئەبێ
هـەرچی وێرانێکی تیـــایە هەروەکـــو گـــوڵشـــەن ئەبێ
(سـەد شوکر شوعلەی چراخـان ڕۆژ بەڕۆژ ڕەوشـەن ئەبێ)
(بەرقـــەرار و پایەدار بێ ســـاحـــێـــبی شـــەوق و حـــەیات)

**

عـیـبـرەت و دەرسـە لەلای ئەهلی نەزەر وەزعی زەمەن
دەرنەچن بۆ عەسری کۆن، لەم وەختەدا هەوڵێ بدەن
دەست لە مل یەکتر بکەن بۆ حیفزی گوڵزاری وەتەن
(دیم نموونەی میللەتی غەیرە کە چۆن خزمەت ئەکەن)
(زابتان و کاپیتان هەروەک نەفەر پۆل پۆل ئەهات)

**

ئیتتیحادێکمان ئەبێ بێ شوبهەیە بێ ڕەیب و شەک
میر و ئاغا فەرقی نامێنێ لەگەڵ خەڕرات و لەک
سەیری کەن چۆن ئەجنەبی حوکمی گەیاندە سەر فەلەک
(بۆ تەرەققی موڵک و میللەت جانفیدا بوون یەک بەیەک)
(ئیتتحادە، یەکیەتی ئینسان ئەباتە ڕۆژهەڵات)

**

(فایق) ئەمڕۆ گەرچی عالەم پڕ لە ئاشووبە و فیتەن
حەزئەکەم دایم لە ڕێی خاک و وەتەندا جان و تەن
کوللی یەکیان پەنجەبازی کا لەگەڵ موڵکی خوتەن
(مەقسەدی زاتیم نییە غەیری وەتەن ئیللا وەتەن)
(چون فیدایی میللەتە (وافی) بەتەحقیق و سەبات)

---

(١) ئەم پێنج خشتەکیی بەختیارە لەسەر پارچە شیعرێکی مستەفا ئەفەندی کوڕی مەلا عەلی عیرفان کە سەردەمێ کاتبی دایرەی (ڕێژی) بووە و نازناوی شیعری (وافی)یە، لە ژمارە ١١ی ڕۆژی ١٩٢٣/١١/٢٩ی ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستقیلالدا بەناوی فایقەوە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام مامۆستا نەجمەدین مەلا لە لاپەڕە ٢٤٠-٢٤١ی کەشکۆڵی ژمارە ٢ی (مینای شکستە)دا بەناوی زێوەرەوە نووسیویەتەوە. من خۆم لە بەختیارم بیستووە کە هی خۆیەتی و ئەم قسەیەم لەلاپەڕە ١٦٢-١٦٣ لە کەشکۆڵی (شەنگ -ژمارە ٢)دا تۆمار کردووە، پاشانیش کە نەجمەدین مەلا دیوانێکی زێوەری لەچاپ داوە ئەم پارچە شیعرەی تیا بڵاو نەکردووەتەوە.

(٢) ئەم نیوە بەیتە لە ڕۆژنامەکەدا بەم جۆرەیە: (ڕۆح فیداکەن بۆ وەتەن، بۆ حوکمڕانی زی سەبات). مەبەست لە (مەلیک) شێخ مەحموودی حەفیدە.

## فرۆكە(١)

سلێمانی، بەهاری ١٩٢٤

دێوێکە گیانی تیا نییە ئەکشێ بەچەشنی مار
بێ دەست و قاچ و خوێنە، بەبێ گۆشت و بێ دەمار
ناو جەرگی پڕ لە ئاگرە، هەردەم کە دێتە ئیش
خۆراکی ئاوە، بێ دەم و دان، بێ سمێڵ و ڕیش
هەرچەندە بێ پەڕە کە لەگەڵ کەوتە ئاسمان
شەش ڕۆژە ڕێگە زوو ئەبڕێ، ناگرێ وچان
ناڵین و گرمەگرمی لە هەستان و ڕۆینا
هەورە برووسکەیەکە بەسەر گیانی دوژمنا
ئەم دێوە گەورە بەچکەیی زانینە ئەی هەژار
زانینە دێو لە ئاسن ئەکا، باڵەکەی لە دار
زانینە گیان ئەخاتە لەشی دار و بەردەوە
زانینە زێڕ و زیو کە دەرێنێ لە هەردەوە
زانینە شاخی گەورە وەکوو لۆکە شڕ دەکا
زانینە جەرگی شەو کە بەڕووناکی پڕ ئەکا
دەریا کە بوو بەڕێگەیی ڕۆژ و شەوی هەموو
زانین نەبێ کە هێزی ئەوەی بێ، مەگەر چ بوو؟!
زانستییە چرایە، وەکوو زێڕی باخەڵە
گیانی وڵاتە بۆ سەر و گوێی دوژمنی پەڵە

(١) کاک حەمەبۆر لە دەستنووسەکەی لای خۆیا لەسەر ئەم پارچە شیعرەی نووسیوە: ئەم هەڵبەستە کە لە لاپەڕە ٢٦١ی کەشکۆڵی (مینای شکستە)ی نەجمەدین مەلادا نووسراوەتەوە و ئەویش لە ژمارە ٤٦ی ڕۆژی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٦ی ڕۆژنامەی (ژیان)ی وەرگرتووە، مامۆستا نەجمەدین مەلا لەبارەیەوە نووسیویە: «زێوەر ئەفەندی بەناوی محەمەد فایقی کوڕییەوە قەیدی کردووە»، بەڵام من لە خودی بەختیارم بیستووە کە هی خۆیەتی و بەهەڵە دراوەتە پاڵ باوکی.

## مام هۆمەری چەرچی

مـام هۆمـەر کـە چەرچێتـی ئیـشی بوو، وردەوالای دەفرۆشت. لەپاش چەند سـالێ دەوڵەمـەند بوو، رێگای کاسـبیی گرت. بەفیکری خۆی لـەو شتانەی کە قازانجی لێ دەکا، چەند بارێکی رێک خست و رووی کردە شـار. لەناو شارا تووشی بەقاڵێک بوو پێی وت:

بەقاڵ (ب): ئەرێ هۆمەر تەشریفت لە کوێ بوو؟ دمێکە دیارنیت؟!

هۆمـەر (هـ): چیت عـەرز بکەم، چەند وەقـتێکە بۆ کـاسبی چوومـە ناو ولاتـی خـۆم بۆ کڕینی بەعزێ ئەشیای نایاب.

ب: عەجەبەن ئەو شتە نایابانە چین؟ بزانم لەسەر مۆدەن؟

هـ: ئەوانەی کە باون چین و ناویان چییە؟

ب: ئەمرۆ لەم ولاتەدا دەسـەسڕی گوڵ گوڵی، عـەینەکی دومانلی، باستۆنی ڕەوغەنلی، لاپچین و قۆندەرەی فەڕەنسە و ئەنواعی شتی تر باون.

هـ: بەخـوا من لە منداڵیما ئەمـانەم نەبیسـتووە، عادەتی ئێمە نـەبووە، ئەوانەی بڵێیت کوردەوارییە هانیومە.

ب: ئەوانە چین؟

هـ: تەپڵـە و کڵاش و فـەرەنجیی هەورامـان، پەسـتەکی بانە، شـاڵی جـزیرە و بۆتان، ڕانک و چۆغەی خۆشناو، زرکاڵی ڕەواندز و هـەندێ جاوی ئەو ڕیسە.

ب: مـام هۆمـەر عـەقڵت بێ ئێسـتاکـە فێست و چاکەت و پانتـۆڵ، قۆندەرەی بیلاد، قـاپووتی تریکۆ، عـەبای شـان سـورمـە، سـەڵتـەی چۆغە، کـەوای تاقـەی سـهولی، گوروونی کلەهارە - باون!

ب: ئەی لە خواردەمەنیدا چیت هانیوە؟

هـ: مێـوژە مـام برایمە، گوێزی هـەورامـان، باسـووق و سـجـووقی شـاربازێڕ، ناسکە هەرمێی وەراز و گردەزبێر، سێ چوار جاغ تووتنی بێشـمە و شـاوڕ و ئەبینی دوو سێ مەشکاڵە گەزۆشم هانیوە.

ب: تۆ ئەڵێی دنیات نەدیوە، ئێستاکە تا چیقۆلانە، فندق و بستە، نوقڵی بۆمبا، حەلەویاتی ئەوروپا، سیگارەی بلاک کات ڕاوەستابێ کێ ئەمانە لە تۆ دەکڕێ، بۆ دۆستایەتی پێت ئەڵێم لە کوێ هێناوتە بیبەرەوە ئەو جێیە، هەتا منالان شوێنت نەکەوتوون بڵێن مام هۆمەر شێت بووە!

مام هۆمەر کە ئەم قسانەی بیست و لە ئەحوالی مەملەکەت گەیشت بەدڵێکی مەحزوونەوە وتی:

ڕوودەکەمە ناو دێهات و عەشائیر، چونکە شار وەک جاران نەماوە، بەڵکو لەوێدا ساغی بکەمەوە. بەقاڵەکە وتی: قوڕبەسەر عەقڵت، هەر ماڵە کوێخایەک بچی، لەهەر سەرکۆماری دابەزیت، زیرەی سەماوەرەکەی، ئاڵووالای خێزانەکەی سەرسامت دەکات. مام هۆمەر کە وای زانی وتی (کل شیء یرجع الیٰ أصله) ئەوا من دەڕۆمەوە بۆ جێگای خۆم، ئێوەش لەپاش ئیفلاس چاک دەبن، ئەوسا شتەکانی من قیمەت دەکا.

فایق زێوەر

ڕۆژنامەی ژیان ژمارە ٤٧ ساڵی ١٩٢٦

# شەرەف

بێکەس و بەختیار زێوەر – کردوویانە بەکوردی

وشـەیەکـە گـەلێ تیـرە لە ئادەمـیـزاد هاواری پێـوە دەکـا، بەڵام گـەلێکیـان لە مـانا ڕاستەقینەکەی ئاگادارنین، دەستەیەکیان لایان وایە شەرەف ئەوەتا لە دروستکردنی کۆشک، بڵند کردنەوەی خانوو، ڕازاندنەوەی دیوار، ژووری نۆکەری و دەسوپێوەند، پەیاکردنی ئەسپ و سواربوونی گالیسکەیە.

دەســـتــەیەکی تریان لایان وایە شــەرەف ئەوەتا لە لەبەرکــردنی جلی نـایاب و خـۆڕازاندنـەوە بەخـشڵ و زێڕە، کـە داڕژابێ بەبەردی وەکـو ئەڵمـاس و یاقـووت و زەمـرووت و وێنەی ئەمـانە. دەسـتـەیەکـیـان وا دێت بەبیـریانا کـە شـەرەف ئەوەتا لە دەستکەوتنی هەندێ لەقەب وەکو بەگ و پاشا یاخو لەو مەدالیانەدا کە پێی ئەڵێن نیشـان و بەو ناوە زل زلانەوە کە هەیانە وەکو یەکەم لە فلان پۆل، دووەم لە فلان پلە جـا چاوت پێ دەکـەوێ گـەلێ پیـاو مـاڵی هاوڕێی خـۆی تالان دەکـا، یا مـاڵی خـزم و نەتەوەی یا هـی هۆزەکەی و هـاوڵاتیـیـەکانی دەدزێ، بۆ ئەوەی بەم مـاڵە حـەرامـە کە چنگی کـــەوتووە کــۆشــکێک دروست بکا، یا خــانوویەک بڵند بکاتەوە یا مـــاڵێک بڕازێنێتـەوە کە دەورویشتی بەنۆکـەر وە پاسـەوانی بۆ دابنێ لە خـزمـەتکار و وا تێ دەگات بەوە گـەورەیی و شانازی پێوەبکا بەسـەر هاوڕێکانیدا، و وا دێت بەبیریا کە گەیشتووەتە پایەیەک کـەس نایگاتێ، خۆی بەم ئەحواڵەی خۆی دەڵێت (شەرەفدار)، وەلای وایە گـەیشـتـووەتـە مـانا ڕاسـتـیـیـەکـەی. هەندێکی تریش هەیە شـەونوخنی دەکـێشـێ و ڕۆژگـار دەبڕێت بۆ دۆزینـەوەی هۆیەک بۆ ئەوەی لقـێک لەو لقـانەی دەس بکەوێ، یا مـەدالیـایەکی چنگ بکەوێ، یا بەرگـێکی ڕەنگاوڕەنگ، ئیـتر ئـەو هـۆیانەی هەمـوو بەلاوە پەسـەندە هەرچییـەک دەبێ ببێ، با نیشـتـمـانەکەشی پێ وێران بێ، یا هۆزەکەی پـێ زەبوون ببێ، یا هاووڵاتیـیـەکانی پێ پارچە پارچە ببێ، لای وایە ئیـتـر گەیشتووەتە (هەرە چڵی بەرزی شەرەف).

ئێمە دەبینین ئەم خـەیاڵاتانە هەمووی لەجێی ڕاستی جێگیربووە لە مێشکی گەلێ

کەسدا، بەڵام لامان وایە چاوی ڕاستی کوێر نەبووە لە عاستیان، ئەوان خۆیان کوێر کردووە بۆ بەجێهێنانی ئامانجیان و لەڕێی ڕاستی لایان داوە.

چی پێ دەگات و بەچی دەبێ ئەوەی شانازی بەکۆشک و نۆکەر و کارەکەرەکانییەوە دەکا؟ ئایا پێ نازانێ ئەگەر بێت و زیاتریش لەوەی چنگ بکەوێ کە بەبیریا دێت خۆی هیچ سوودێکی لە کەمال وەرنەگرتووە، وە ئەو هەموو شتانە کە پەیای کردووە، بەخوێش و بێگانەوە دوورە لێی و هیچی پێ نابڕێت لەو دەردەسەرییە زیاتر کە بۆی کێشاوە، ئایا نابینێ ئەوانەی گەیشتوونە ئەو پایە و بڵندتر بوونەوە، چەپگەرد هەمووی لە چنگ دەرهێناون، هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە بەو خووڕەوشت و سەروسیمایەوە کە بوویان، ئەگەر لە کەماڵی ئینسانی بێ بەهرەبووبن چوونەتە ڕێزی دەستەی بێ ڕێزەوە لە هیچ دڵ و دەروونێکدا جێگایان نەماوەتەوە.

چی پێ دەبڕێ ئەو کەسەی شانازی بەخشڵ و جلەکەیەوە دەکات، ئەگەر ئەوانەی لەبەر دابکەنێت و بەڕووتی بمێنێتەوە ئەگەر خۆی خاوەنی کردەوەی بەرزی بەنرخ و خاوەنی جوانیی پێگەیشتن نەبێ، ئاخۆ سواڵکەرە ڕووت و قووتەکان لە ڕێز یەکانین؟ ئایا پێ نازانێ ئەو کەسەی دڵخۆشیی خۆی دەداتەوە بەخۆهەڵکێشان، هەمیشە لەگەڵ تیاترۆ و ئافرەتی خراپا لە کۆڕێکا دێن و دەچن؟ چی پێ دەبڕێت ئەوەی بەڕوتبەکەی دەنازێ و بەمەدالیاکەی بایی بووە، ئەگەر لەپێش ئەوەدا بگاتە ئەو مەدالیایە و، بڵند بێتەوە بۆ ئەو ڕوتبەیە، لەسەر ئەحواڵێک نەبووبێ، بەگەورە زانرابێ، یا پێگەیشتێکی نەبووبێ بەگەورە ژمێررابێ، ڕەنگە لێی دابکەنرێت دەچێتەوە دۆخی ڕیسوایی جارانی؟ گریمان بەو لەقەب و نشانەی کە هەیەتی لای هەندێ نادان حورمەتی بگیرێ، ئایا ئەو حورمەتە لەبەر لەقەبەکەیە یا لەبەر خودی خۆیەتی؟ کەوابوو دیارە ئەمە وێنەیەکی ئاشکرایە کە هیچ دەخلێکی بەسەر نەفسی خۆیەوە نییە.

بەڵێ ئەو لەقەبە بەنرخانە ئەوەندە هەیە بەڕادەیەک سەری پیاو بڵند بکاتەوە، کاتێ لەپێشەوە ئیشێکی کردبێ کە هەموو کەس گەواهیی بۆ بدا کە بە ئەو ئیشەی شەرەفدارە. وە ئەو لەقەبە بەڵگەی ئەو ئیشە بەشەرەفە بێت، بەپێچەوانەی ئەوەش تووشی شکاندن و بەدناوی دەبێ ئەگەر پێشەکی ئیشێکی کردبێ، خەڵکی

بەناشرینی بژمێرن، جا ئەو مەدالیایەیە یا ئەو لەقەبە دەبێتە سەر ڕوشتە بۆ ئەوەی خاوەنەکەی چی دەس کەوتووە یا دەبێتە نیشان بۆ ئەوەی چ خراپەیەکی لێ ڕوودواوە.

سەرنج دە و وردبەرەوە ئەو عوسمانی غازییەی کە دوشمنەکانی ناویان نا بەشێری شەڕکەر گەیشتە ڕوتبەی لەقەبی پێ بەخشراو چووە پایەیەکی بڵند لەناو دەستەی پیاوە گەورەکانی حکوومەتەکە، پاش ئەوەی گیانی خۆی هاویشتە گێژاوی مردنەوە بۆ پاسی هۆزەکەی و هەوڵی دا بۆ بڵندکردنەوەی ئاینی خۆی، بەڕەنگێک کە دۆست و دوژمنی خۆی دانیان پیانا (هەندێکیش لە پیاوە گەورەکان لەناو ئیسلاما لەقەبی بەرز و نایابیان پێ بەخشراوە، لەبری ئەو ئیشانە کە کردوویانە بۆ پێشڕەویی سوپای دوژمنەکانیان، تاکو ئەو حکوومەتە بێگانەیان لە وڵاتەکەیانا جێگیر کردووە، ئێستاش زۆری موسڵمانان هەوڵ دەدەن و کۆشش دەکەن بۆ ئەوەی شتێک بدۆزنەوە و دەریان پەڕێنن و لەو حاڵە ڕزگاربن.

جا ئەو جێ نیشانە لە کوێ کە بەسنگی عوسمان پاشای غازییەوە بوو لەگەڵ ئەو جێ نیشانەی کە بەسنگی ئەو تەفرە دراوانەوەیە، وا ئەزانم بەتەماشاکردنێکی ئەم دوو جێیە لێت ئاشکرا دەبێ کە نیشانی شەرەفدار دەبێ بەو فرمانە بەرزەوە کە بەڵگەیە بۆ ئەو و بێ نرخیش دەبێ بەبێ نرخیی ئەو فرمانە، چە شتێک ئەو گومرایانەی لەخۆبایی کردووە؟ ئایا نازانن ئەو بەرگانەی خەت خەت و خاڵ خاڵ کراون بەخوێن و ڕەنگاوڕەنگ کراون بەجەوانمەردی، ئەوەیە ناوی چاکی پاراستووە بۆ خاوەنەکەی و نابڕێتەوە، و شوێنێکی گەورەی دروست کردووە کە لەناو ناچێ؟ ئەوانەی لە ڕێی هەوڵ و کۆششێ کە بۆ بڵندیی هۆزەکەیان داوە لە خوێنی خۆیانا تلاونەتەوە، ئەوانەن کە باسیان کرا بەترس و سەماوە گوێیان لێ دەگیرێ. وە لە هەموو دڵێکا پایە بڵندییان جێگیربووە، ئایا نەیان بیستووە ئەوانەی مردوون لە کون و قوژبنی زیندانا وە ژیانیان کۆتایی هاتووە لە تاریکی بەندیخانەدا لە پێناوی حەقێکی داگیرکراو، یا بۆ پاراستنی گەورەییەک بوویێت ئەوانەن ناویان بڵند بووەتەوە و گەیشتوونەتە ئاسمان و ناویان بەسەر گشت ناوێکدا بەرزبووەتەوە.

وا دەزانم ئەوانەی کە لە ژووری کۆشکی بڵندیانا بوون و تەماشای باخ و بێستانەکانیان دەکرد و دەیانڕوانییە خەڵکی لەسەربانی کۆشکە بەرزەکانیانەوە،

ژیانی خۆیان ڕادەبوارد بەخۆشی دەستکەوتنیانەوە باسیان کۆتایی هات، وە لە ژیانیانا هیچیان دەس نەکەوت تەنیا ئەوە نەبێ کە لە چوار دیواری ماڵەکەیانا بوویانە. هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئەواندا، ئەوانەش کە جلەوی ناز و نیعمەتیان ڕادەکێشا و جلی ئاوریشم و دیبایان پەیا دەکرد هەموو ڕۆیشتن بەخۆیان و جلیانەوە، پاشەویاش چوونەوە بۆ ئەو جێیەی کە لێی هاتبوون. نازانرێت کەی هاتوونە سەر ئەم زەمینە و کەی کۆچیان لێ کردووە.

ئایا بیستراوە کەسێک ناو ببرێت لەناو خەڵقا و بڵێن ئەمە نیشانێکی وای وەرگرتووە و گەیشتووەتە پلەیەکی بەرز؟ نا: بەڵام دەڵێن تێگەیی و ئیشی کرد، بەخشی و لەناوی برد، بڵندی کردەوە وا دای نا، تێ کۆشا و بەرهەڵستی کرد، لەناوی برد و هێشتییەوە لەگەڵ ئەو ئیشانەی کە هاوتای ئەمانە بکات و شوێنی بمێنێ، ئەگەر باسی ئەسکەندەری گەورە بکرێت ئاخۆ بەدڵا دێت کە کۆشکی بووە یا نا؟ چە شتێک هەیە بگەڕێت بۆ کردەوەی ناپلیۆنی یەکەم لە شوێنی ئەو کۆشکەی کە تیا دادەنیشێت یا لەو جلە شڕوشیتاڵانەدا کە لەبەری دەکرد، ئایا گەورەکانی دنیا بەخانووکردن و خۆڕازاندنەوە و ناز و نیعمەت گەیشتوونەتە پایەی بڵندی شەرەف یاخو بەگەورەیی وڵات داگیرکردن و سەرکەوتن و زەبر و زەنگ چنگیان کەوتووە؟ هەندێک بەخەوی خۆش تەفرەی خواردووە و بایی بوون بەخەیاڵات، و دەستدرێژییان کردووە لە ئیشی نیشتمانەکەیانا، ئەو شەرەف و گەورەییە بڵندەی کە بوویەتی فرۆشتوویانە بەو ناو و ناتۆرانەی کە بۆ هیچ دانەنراون و وا تێ گەیشتوون ئەگەرچی دڵیان باوەڕی پێ نەکردووە کە گەیشتوونەتە شەرەف و گەورەیی لەپاش ئەمە کە زانیویانە ئەو ڕوتبە و نیشانانە لە سنووری خۆی تێ پەڕیوە وە چنگ ناکەس کەوتووە. ئەگەر ئەوانە بێن و گوێ بگرن لەوەی کە بەدڵیانا دێت و لەو سەرزەنشتانەی دڵیان پێیان ئەکات و چاو بگێڕن و بەچواردەوری خۆیاندا و تەماشای ئەوانە بکەن کە دەوری داون، ئەوسا دەزانن لەپێشترین جێ سووکترین شوێنی بەدناویان و خۆیان هەست دەکەن کە لە مەعنای شەرەف بەهەڵەچوون، و تێ دەگەن لە ڕێی ڕاست لایان داوە و دوورکەوتوونەتەوە ئەگەر پێ بزانن وڵاتەکەیان تووشی چە چورتمێکی گەورەبووە، وە چە بەندگی و شوورەییەک ئاڵاوەتە نەتەوەکانیانەوە، بەرگە ڕەنگاوڕەنگ و مەدالیاکانیان. توور دەدا و بەرگی ڕەشیان

دەپۆشی و بەکۆمەک لەسەرخۆ دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی شەرەفی ڕاستەقینە.

شەرەف ڕاستییەکە ئاشکرا و دیارە کە ئاین نشانی داوە و بیری زانایانی زەمین سنووریان بۆ داناوە، ڕەوانییە هیچ کەس لە ئادەمیزاد دوودڵ بێ لە تێگەیشتن (مەگەر ئەوە نەبێ کە یەزدان دڵی ڕەش کردبێ و پەردەی تاریکیی بەسەر چاویا کێشابێ).

شەرەف جوانیی پیاوە، هەموو لێی ورد دەبێتەوە، بیر و خواهشی دڵان ڕووی تێ دەکا، جوانییەکە وێنەی لەبەر چاو و دڵان خۆشەویستە، ڕووناکیی ئەو جوانییەش ئیشێکە کە خاوەنەکەی بیکا و شوێنێکی جوانی بێ لەناو هۆزەکەیدا، یا لەناو نەتەوەی هۆزەکەیدا، یا تێکڕا لەناو گشت ئادەمیزاددا وەکو ڕزگارکردن لە چورتم، یا دەرخستن و لابردنی نەزانی، یا وریاکردنەوە بۆ داواکردنی حەقێکی داگیر کرابێ، یا وریا کردنەوە لە هەڵئەنگوتن، یا بێدارکردنەوە لە بێ هۆشی، یا ڕێ نیشاندان بۆ چاکەیەکی گشتی، یا پاراستن لە خراپەیەک دڵتەنگی لەدوا بێ، یا لەناوبردنی کردەوەی ناشرین یا بیر ڕووناک کردنەوە، یا هێنانە بەرهەمی یەک قسەیی و تازەکردنەوەی دۆستایەتی، یا سەندنەوەی هێزێک و ڕزگارکردنی لە بێ دەستەڵاتی، یا هاندان بۆ ئازاییەک. کەوابوو کەسێک ئەگەر ئیشێکی کرد و شوێنێکی بوو لەوانەی کە وتمان ئەوە (شەریف)ە بام لەناو زنج و ژێر گەڵادارا دانیشتبێ و جلەکۆن و خەرقە شڕی لەبەرا بێ و سەوزایی دەشت و خواردەمەنی بێت و شەو لەسەر گڵی هەژاری ڕۆژ بکاتەوە و بەرد بکا بەسەرین و سەر بەهەموو دۆڵێکا بکا و هاتوچۆ بکا لە بەرزایی و نشێویدا، ئەمە خشڵێکی هەیە لە کردەی خۆی، جوانییەکی هەیە لە پێگەیشتن، ڕەونەقێکی هەیە لە کەمالی، ڕووناکییەکی هەیە لە تێکۆشینی، ئەوانەی هۆشیان لێ گوم بوبێ و دڵیان پەرێشان بی ڕووی تێ دەکەن، خاوەنی بیری ورد دەیناناسن و ڕوویان لێ وەرناگێڕن کۆمەڵێ دڵانی پاک و ئاوارە دەورەیان لێ دەدەن و لێیان جیا نابنەوە، لەو گیانەی کۆشکی بڵند و ژووری ڕەنگاوڕەنگ دیمەنی جوان جوان و جوانیی پڕ لە ڕووناکی و پرشنگی درەخشانی هەیە، وشەی پیرۆزی ڕوو لەو دەکا ئیشی جوانیشی بڵندی دەکاتەوە بۆ بەرزترین بەرزی، ژیانێکی پیرۆزی هەیە لە وڵاتا و شکۆهێکی درەخشانی هەیە لە چاوی گەردوونا (ئەوانەی کە تێ دەکۆشن با بۆ شتی وا تێ بکۆشن).

بەڵێ زۆر جار قسەی ناشرین و سەرزەنشت ڕووی تێ دەکا لەلایەن ئەوانەی کە دڵ و دەروونیان پیسە، پلار و توانجی تێ دەگرن و لۆمەی دەکەن، خونچەی کردار و گۆپکەی درەختی باخەکەی لەبەر چاویان جوان نانوێنێ، چونکە لە تێگەیشتنی ئەوانەی دوورە و عەجائیبە لەلایان لەبەر ئەوەی هێندە بەسەر ئەو شتە ناشرینانەدا کەوتوون کە خۆیان بەشەرەفی دەژمێرن و بەگەورەیی دەزانن، ئێمەش باسمان کرد کە چۆن ئایین ئاشکرای کردووە لەگەڵ بیری تێگەیشتووان، ئەوانە وەکو قاڵۆنچە وانە کە لە بۆنی گوڵ ڕادەکا و دەچێتە ناو شتی بۆگەنەوە، هیچ بەدووری مەزانە ئەوانەی کە کرداریان جوان نییە گاڵتە بکەن بەزانای ئیشکەر، یا بیەوێت زیانی پێ بگەێنێ ئەوەی کە هیچ کەس نایناسێ، بەڵام گاڵتە بەخۆیان دەکەن و زیان لە سوودی خۆیان دەدەن گەردوون ئەوەندە ماوەیان نادات لەو کوێرەوەرییەدا کە تێی کەوتوون بگرە خۆشیان خۆیان ناگرن ئەگەر میوەی کرداری هاتەبەر بەکۆمەڵ ڕادەکەن بۆ چنینی و بەشی ئەوەشی لێ دەدەن کە زیانی پێ گەیاندووە، ئیتر هیچمان لە بارا نامێنێ مەگەر هەر سوپاسی ئەوە بکەن کە ئەو درەختەی ناشتووە و چاودێری بەرەکەی کردووە، هەرچەندە لەوان خوارتر بێ لەو شتە پڕوپووچانەدا کە نرخی نییە لای پیاوی تێگەیشتوو جا لە تۆڵەی ئەو ئیشە خراپانەدا کە کردوویانە هیچیمان بۆ نامێنێتەوە تەنیا ئەوەنەبێ کە لە کردەی خۆیان پەشیمان ببنەوە و خەمی خراپی خۆیان بخۆن و دڵتەنگ بن بەدڵ کاتێ بەخراپی خۆیان بزانن وە بەتەواوی لە کەموکورتی خۆیان بگەن.

ئە ئەوها چاودێریی یەزدانی پاک ئەم گەورەییە دەبەخشێ بەخاوەنی ئیشی پیرۆز هەتا زیندوو بێ، کاتێ کە ڕۆژی ژیانی لە ئاسۆی ئەم گێتییەوە گوم بوو، ئەو پرشنگی ڕووناکییەی ناشارێتەوە کە سارێژی کردووە بەسەر ئەستێرەی ڕێ نیشاندەر و مانگی شەوی چواردەدا، بەڵێ دەمرێت و دەچێتە ژێر پەردەی نەمانەوە بە لەش، بەڵام هەمیشە لە دڵانا دەمێنێ وە بەزمان باسی دەکرێ زیندووە لای خوا خواردەمەنی دەدرێتێ ژیانی ئەو شیرینترین ژیانە (وە دەبێ ئادەمیزاد بۆ ئەم جۆرە فرمانانە هەوڵ بدا و تێ بکۆشێ).

* لە گۆڤاری (عروە الوثاق)ی جەمالەددینی ئەفغانی و شێخ عەبدەوە وەرگێڕراوە.

کورتە چیرۆک

## شەوێک لەسەر لوتکەی ئەڤەرست

شەوە تۆفەکەی ١٥/١٢/١٩٤٤ز لە ماڵەوە بۆ خۆم بەتەنیا دانشتبووم قۆرییەکەم دەم کردبوو، پەیتا پەیتا چام دەخواردەوە، پاش چا خواردنەوە، دەستم دایە کتێبێک و لەبەر چراکە دەستم کرد بەخوێندنەوەی، لە خوێندنەوەش تاقەتم چوو، کتێبەکەم داناو کەوتمە بیرکردنەوە. زۆری نەخایاند گوێم لێ بوو یەکێک لەسەرخۆ دای لە دەرگا، بەدەم دەنگی دەرگاوە ڕۆیشتم کە دەڕوانم ئەفەندییەکی پۆشتە و پەرداخ، هەرزەکار، نەدیو نەناسیو وەستاوە، شەوباشی لێ کردم و دەستمی گوشی، وەڵامم دایەوە وتم: فەرمانت چییە؟ وتی: جەنابی (فلان کەس) ئیمشەو نەختێ ئیشی تایبەتیم پێتان هەیە تکا دەکەم وەرە لەگەڵم پێت دەڵێم، (منیش لەو وەختەدا لە دڵی خۆما وتم میوان ئازیزە با ڕووی لێ نێم بەڵکو بێتە ژوورەوە، بەڵام هەرچەند تکام لێ کرد سوودی نەبوو، با برۆین لەگەڕانەوە قسەت بۆ دەکەم) ئیتر لەبەر ئەوە نەوەک شەو درەنگ بێمەوە، چووم ماڵەوەم ئاگادار کرد و پێم وتن کەوا هاتوون بەدواما دەڕۆم، ئنجا زوو گەڕامەوە بۆ لای میوانەکە و. لەسەرخۆ دەستمان کرد بەڕۆیشتن، جارێ لەپێش ئەوەدا کە ناوی خۆی و ئیشەکەیم پێ بڵێت دەستی کرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی وە دەیوت: لە تورکیا سێ ساڵ مەئموور بووم، لە بەغدا چوار ساڵ مووزەف بووم، لە ئێران دوو ساڵ بازرگان بووم، لە سووریە ساڵێک کاسب بووم، تا بەدەم ئەم قسانەوە گەیشتینە نزیک گردی سەیوان، لەوێ ڕاوەستا و ڕووی تێ کردم و فەرمووی (فلان کەس) چ بی لە تۆ نهێنی من خدری زیندووم، ناردوویانم بۆ لای تۆ. دەبێ لەگەڵما بێیت بۆ هەر کوێیەکت دەبەم، لەو دەمەدا ترسم لی نیشت و وتم: بەم شەوە ساردە، بەم شەوەزەنگە کە هەموو کەس لە خانووی خۆیانا لەبەر ئاگردان کزۆڵە دانیشتوون، ئێمە بۆ کوێ بچین؟ بەم شەوە من هەر لە سەرما ڕەق دەبمەوە، وتی: تۆ هیچ ترست نەبێ نە لەمن و نە لەسەرما، چونکە دوعایەکم خوێند بەسەر و

ڕووتا هیچ هەست بەسەرما ناکەی، ئیتر دوعایەکی خوێند بەسەر و چاوما بەڕاستی سەرمام لەبیر چووەوە، وتم: فەرموو با بڕۆین بۆ کوێ ئەفەرموویت، پێشم کەوت و ڕۆیشتین، وردە وردە بەگردی سەیوانا هەڵگەڕاین و بەناو گۆڕستانەکەدا چووین بەو دیوا، لەوێ ڕاوەستا و ڕووی تێ کردم وتی: (فلان کەس) وەکو مەشقی منالانی قوتابخانە کە دەس دەکەن بەڕۆیشتن لەپێشانا قاچی چەپ فڕێ دەدەن، دەستی ڕاستت بدەرە دەستم و چاوت بقوچێنە کە لەگەڵ وتم: (لەسەرخۆ هەنگاوێک بۆ پێشەوە برۆ) قاچی چەپت فڕێ بدە و قاچی ڕاستت بەرە لای قاچی چەپ، چاوم نووقان، فەرمانەیی کردم، قاچی چەپم فڕێ دا و قاچی ڕاستم بردە لای. کە چاوم هەڵبڕی، سەیر دەکەم وام بەسەر شاخێکی زۆر بەرزەوە و هەناسەم سواربووە، وتم: لە ڕایی خودا ئێرە کوێیە؟

وتی: ئەمە شاخی هیمالایەیە و ئەچین بۆ (لووتکەی ئەڤەرست)، زۆر سەرم سووڕما وتم: گوایە لە زەمیندا جێ بڕاوە ئێرە نەبێ؟ فەرمووی لەسەر زەمیندا ئێرە جێیەکە ئادەمیزاد دڕی پێ نەبردووە، هەرچی پیاوچاک هەیە شەوی هەینووان لێرە کۆدەبنەوە، خۆ ئەگەر ئێرەشیان کرد ڕێی بانە، ئەوسا ناچار لێرەش دەگوێزینەوە، و جێیەکی پەنا دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی کەس نەیەت بەسەرمانا، ئەو ماوەیەی کە مابوو بۆ سەر لووتکەکە ئەوەشمان بڕی و گەیشتینە سەرێ کە تەماشا دەکەم ئەو جێیە بەرز و جوان و خۆش کراوە مێز ڕازاوەتەوە و چراخانە و پڕە لە پیاوچاک، هەموو بەڕێزەوە لەسەر کورسی دانیشتوون و قسە دەکەن لەگەڵ یەکتری، لەولاشەوە خیوەتێکی گەورەی سپی هەڵدراوە، بەڵام کەسی تیا دانەنیشتووە، لێیان نزیک بووینەوە و حەزرەتی خدر سڵاوی کرد، هەموو بەجارێ وەڵامیان دایەوە و لەبەرمان هەستان و بەیەکەوە دانیشتنەوە، یەکەیەکە خۆش هاتنیان لێ کردین و منی پێشکەش کردن، ئیتر بەشەرمێکەوە لەسەر کورسییەک دانیشتم و نقەم لەخۆم بڕی و گوێم لە قسەکانیان دەگرت کە دەیانکرد، دیمەنێکی سەیر لە هەموو هۆزێکی تیابوو، هەر تیرەیەک بەبەرگی وڵاتی خۆیەوە، هەرکەس بەجلی ڕۆژەوە، کە چاک وردبوومەوە و گوێم لە قسەیان باش گرت، زۆریانم ناسی و کەمێکیان کە نەمدەناسین ناوم بیستبوون، زۆریان لەو ئەفەندییانە بوون کە زۆر کەس بەبێ دین و زەندیقیان دەزانن،

و گەلێکیان لەوانە بوون کە مەلا فەتوای دابوو هەرکەس بیانکوژی دەستی سەوز دەبێ زۆرم پێ خۆش بوو کە ئەوانەم دی لە ڕیزی پیاوچاکا بوون، ئینجا هات بەدڵما وتم: (هەر خوا بەندە ناسە) ئێستا ئەمانە کێ بڕوایان پێ دەکات کە پیاوچاکن، خەڵق هەموویان بەنوێژ نەکەر و عارەق خۆر و قومارکەر و کافر و پیاوخراپ دادەنێن کەچی ئەوەتا لە شەوی هەینووا بەخۆیان و باستونەکەی دەستیانەوە لەناو پیاوچاکانا لەسەر پۆپەی شاخی هیمالایە کۆریان گرتووە دوعای چاک بۆ هەموو هۆزێک دەکەن و لە بارەگای یەزدانی پاکدا دەپاڕێنەوە و دەلاڵێنەوە کە ئاسایش و هەرزانی بچێتەوە دۆخی جاران.

لەو وەختەدا سەیرم کرد لە ئاسمانەوە دوو فریشتە هاتنە خوارێ و سڵاویان کرد، هەموو لەبەریان هەستان و وەلامی سڵاوەکەیان دانەوە، هەردووکیان ڕاوەستان و ئەمانیش دانیشتنەوە (کە گوێم گرت لەو دیو خێوەتەکەوە، دەنگی کرووزانەوە و خرەخرِی زنجیر و پێوەند دەهات، بەبیانووی گەڕانەوە چووم و لێی نزیک بوومەوە، کە تەماشا دەکەم سەرقژنێکی ڕووت و قووت و چڵکن و پیسە، زنجیر و پێوەند کراوە، سەری زنجیرەکەش لە خاک توند کراوە، سەرەڕای ئەوەش چوار کەس بەچەکێکی تایبەتیەوە بۆ چاودێری وەستاون، لێم پرسین ئەمە کێیە؟ کەچی یەکێکیان وتی: (بو عریف شیطاندر)، لەو وەختەدا حەزرەتی خدر هات بەشوێنما فەرمووی ئەوە بۆ کوێ چووی؟ وتم: قوربان گوێم لە دەنگی ئەم کابرایە بوو زۆر بەسەیرم زانی و هاتم تەماشای بکەم و بزانم کێیە، فەرمووی وەرە دانیشە چیتە بەسەریەوە، وتم: دەمەوێ بزانم ئەوە کێیە؟ فەرمووی ئەوە ئەهرەمەنە، وتم: ئەی بۆچی بەسراوەتەوە؟ فەرمووی: کوڕە لەسەر زەمیندا هێندە پیاوی ساختەچی و فند و در و دوو زبان و بێ دین پەیا بووە مەگەر خوا بزانێ چەند زۆرن، هی وا هەیە بەساتێک دڵی هەزار دۆستت بۆ لەیەک دەکا، هی وا هەیە بەهەناسەیەک دوو عەشیرەتت بۆ دەکا بەدوژمن لە یەکتری، هی وا هەیە ڕۆژی ٨-٩ کەست بۆ لە ئاین وەردەگێرێ، هی وا هەیە ٦-٧ هۆزت بۆ دەکا بەگژ یەکا و هەزاران خوێن دەڕژێن، هی وا هەیە برات بۆ لە برا دەکا، ئەم چەرخە ئادەمیزاد پێویستی بەئەهرەمەن نەماوە وا ئێمەش هێناومانە لێرە زنجیرمان کردووە و یاساوڵمان بەدیارەوە داناوە و هەرساتە نەساتی دەناڵێنێ و

دەکرووزێتەوە و دەڵێ دەچم بۆ لای جگەرگۆشەکانم، ئێمەش وامان فەرمان پێ کراوە کە جارێ بەرەڵڵای نەکەین، چووینەوە دانیشتین.

فریشتەکان بەزبانێکی خۆش سەلامی یەزدانیان گەیاند بەو کۆمەڵە و وتیان یەزدان دەفەرمووێ لە نوور و ناوچەوانی ئێوەوە سەرزەمین ڕووناکە، تکا لە گەورە و بچووکتان ئەکا ئیشی سەرزەمین چی پێویستە جێبەجێی بکەن هەتا لە بیری خۆشەویستانە خۆمانی بگەین، لەو وەختەدا یەکێک لە پیاوچاکەکان قەیدێکی گەورەی هێنا و دەستی کرد بەناو خوێندنەوە، گەلێ ناوی پیاوی گەورەی هەڵدا، هەموو بەجارێ دەیانوت: (بژی) و قەڵەمی ژیان بەسەر ناویان دەکێشرا، پرسیم بۆچی ئەمانە وا قەڵەمی ژیان بەسەر ناویان دەکێشن؟ وتیان ئەمانە لەوانەن کە گیانی خۆیان بەخت کردووە بۆ ئامانجی پیرۆز، بەڕەنگێکی وا کە مێژوونووسەکان لە لاپەڕەی دێرێکا بەگەورە و جوانمەردو ناویان دەبەن، خۆ ئەگەر لەو پیاوانە نەبن بەمردوو دەژمێردرێن. دوای ئەوانە گەیشتە سەر چەند ناوێک، کابرا تێک چوو، ڕەنگی هەڵبزڕکا ئینجا ناوەکانی درکان. بەکۆمەڵ وتیان (نەژی) کە ئەهرەمەن گوێی لەمە بوو لەو دیوەوە هاڕاندی وتی هایل هایل[1] گورج یاساوڵەکان هاتنە وێزەی تێروپڕیان لێ دا، بەڵام بێ سوود بوو، ئەو لەسەر عەشقی خۆی بوو.

کە دەیوت (هایل هایل) و فروهۆڕی پێوەندەکەی دەدا بەزەویدا، شاخەکە دەنگی دەدایەوە، لەو وەختەدا یەکێک لە پیاوچاکەکان وتی: لێدان بێ کەڵکە ئەم ئەهریمەنە پیسە سەرمان لێ دەشێوێنێ و لە هیچ ناترسێ لە ورچی سپی نەبێ، یەکێکیان بانگ بکەن، ورچێک بێت و بەرامبەری دانیشێ تەواو بێدەنگ دەبێ، لەپڕ یەکێکیان بانگی کرد (یا دب الأبیض یا دب الأبیض) ئەوەندەمان زانی ورچێکی قەڵەوی چوار شانەی سپی بەبۆڵەبۆڵ هات.

تێیان گەیاند، ورچە ڕای کرد تاوێرێکی زلی خستە سەر سەری و چوو بۆ لای، ئەهرەمەن چاوی پێ کەوت لە ترسی خۆی و تاوێرەکەی ورتەی لە خۆی بڕی، ئیتر لەسەرخۆ خەتێکی ڕەشیان بەناوەکانیشدا هێنا. کابرا لە دوای ئەوە دەستی کرد بەخوێندنەوەی ناوی تر، بەڵام لە بەرامبەری گەلێک ناوا دەیاننووسی (مەرگی کتوپڕ)، زۆر سەرم سووڕما، لە حەزرەتی خدرم پرسی بۆچی ئەوەندە مەرگی کتوپڕ

زۆر کرا؟ فەرمووی ئینسانی ئێستا ئەوەندە چاو برسییە، هی وا هەیە نەخۆشی دەگرێت کەچی لە جێدا بۆی ناکەوێ، بەو نەخۆشییەوە بەلەقەلەق و نکەنک دەڕوا بۆ بازاڕ، بۆ وڵاتان، بۆ دەرودەشت هەر بۆ پارە پەیاکردن و شت پێکەوەنان ئەوەندە بێ باکن، وە لەلایەکی تریشەوە کە سووکە تایەکیان گرت هەزار داو و دەرمان دەدۆزنەوە و خۆیان چار دەکەن و نەخۆشیی مەرگیش دەرەوێننەوە، لێرەدا وەختە بڵێم فریشتەی گیان کێشان نازانێ چۆن و لە کوێ گیانیان بکێشێ، ئێمەش ئەم مەرگەمان بەباشی داناوە، بەکاری بهێنین، ئەوسا فریای ئەوە ناکەون کە دەرمانیان بگاتێ، ئەوانیش لە گەرمەی کاری خۆیان دەبن کە کۆتایی بەژیانیان دەهێنرێت، دیسان ئاگام لێ بوو بۆ گەلێ هەرزەکار دسەیاننووسی (جوانەمەرگ) و بۆ گەلێ پیاوی پیر دەیاننووسی (بابەعەمرە) لەمەش سەرم سووڕما و لە حەزرەتی خدرم پرسی؟ فەرمووی ئەم پیرانەی ئێستا ماون بۆ کردەوە و ڕەوشتی جوان و ئیش ڕاپەڕاندنیان لە زۆر گەنجی تەمەڵی خۆ پەرستی بێ سوود چاکترن، ئەوان بمێنن باشە، ئەو گەنجانەی کە تۆ گوێت لەناویان بوو هیچیان کەلکێکی هاودین و هاوڕێ و هۆزەکە و نیشتمانەکەیان ناگرن و کە گەیشتنە تەمەنی ٢٥ ساڵی یان دەبن بەمیچی قومارخانە یان دەبن بەپیری موغان کەواتە مردنیان چاکترە لە زیانیان، ئیتر دوایی ناو هات و هەموو مۆریان کرد و پێشکەشی فریشتەی گیان کێشانیان کرد.

ئینجا پیاوچاکێکی تر هەستا و قەیدێکی هێنا و دەستی کرد بەناو خوێندنەوە، لەمانە زۆریان خەڵقی ڕۆژئاوا بوون، بەڵام تێ نەگەیشتم بۆچییە.

لە حەزرەتی خدرم پرسی فەرمووی ئەمە قەیدی کەم و زۆری پارەیە ئەوانەی کە بۆ خۆیان و کە خزم و دۆست و برا و وڵاتەکەیان چاک بن گەورەی ئەم پیاوچاکانە دوعای باشیان بۆ دەکا و ئەوانیش بەکۆمەڵ دەڵێن خوایە گیرابێ، لە وڵاتی ئێمەدا هاتە سەر چەند کەسێ دەمناسین کە ناویان خوێندنەوە، وتیان (ئیتر بەس بۆیان زیاد ناکرێ) پرسم کرد لە هاوڕێکەم نەچووی ئەوانە لێیان بووەتە ماخۆڵان کە پارەیان زۆر بوو لە بری ئەوەی کە بیدەن بەهەژار و دەسەپاچەی وڵاتەکە و خزمی لات و برسی، کەچی لە پڕێکدا خۆیان کۆدەکەنەوە و دەچنەوە ماڵی خودا هی وایان هەیە چوار حەجی یەدەکی هەیە وا ئیتر ئەو هیوایەیان پچڕا، بشچن بۆیان بەخێر نانووسرێ یاخود هی وایان هەیە کە بۆی زۆرکرا لەباتی ئەوەی بی بەشێتەوە کەچی

دەیکات بەکـۆشـک و ئوتێل و گـەراج و خـۆی بەنانـی گـاڵ و شـۆربای مـاشین ڕادەبوێرێت.

هەمیسان چەند ناوێک خوێندرایەوە زۆر کەمدەس بوون کەچی سامانیان بۆ نووسین لەمەش سەرم سووڕما، کە پرسم کرد وەڵامیان دامەوە، وتیان ئەمانە هەرچەندە بێ پول و پارەن، هەرچەند بەرەنجی شـان و ئەمـلاو ئەولا پارە پەیدا دەکەن، هیچ بەرگەیان ناگرێت، لەپڕێکا دەیکەن بەقاوەڵتی بۆ دۆست و برادەر، یا دەیکەن بەچێشت و گۆشت دەرخواردی هەژاری دەدەن یا دەستی لێقەوماوی پێ دەگرن ئیتر هەرچی پەیدا بکەن، بەرێگەیەکی جوان کە خودا و بەندە پێی خۆش بێ لە ناوی دەبەن. توخوا پارە بۆ ئەوانە چاک نییە؟ بەرێ وەڵڵا.

ئینجا نۆرە هاتە سەر پۆلێک دەوڵەمەند کە ناویان خوێندنەوە زۆریان بۆ نووسین، پیاوچاکێک هەستایە سەرپێ وتی: ئەمانە دەوڵەمەندن بۆچی هی تریان بۆ دەنووسن؟ پیاوچاکێکی تر ڕووبەڕووی هەستا  وتی: بەڵێ جوان دەفەرمووی وایە، ئێمە تاقییان دەکەینەوە بزانین کە زۆرتر بوو چی لێ دەکەن. ئەگەر هاتوو هەر دەیانشاردەوە و سوودێکی نەبوو، بۆ هەژار و بێ دەسەڵات. ئێمەش لە کۆبوونەوەیەکی ترا لەوانی دەشارینەوە. ئەگەر نەشمان شاردەوە لە پەردەی غەیبا بانگی چرووکی و بەدناوییان بۆ دەدەین کە هەموو کەس نەفرینیان لێ بکا.

دیسان قەید بەدەستێک، دەستی کرد بەناوخوێندنەوە و چەند ناوێک بوو دوایی ناوی منیشی خوێندەوە. کە ناوم خوێندرایەوە، هەموو بەجارێ ڕوویان تێ کردم و گەورەکەیان فەرمووی وا خـۆت لێرەی چۆنت بۆ بنووسم؟ چیت بۆ بنووسم؟ وتم: قوربان بڵێم چی. وتی: نا ڕاست بڵێ. وتم: خۆتان ئاگادارن ئیتر چی لەمن دەپرسن، وتی: کـوڕم تۆ خوێندنێکی بەرزت نییە و نەشزانی ئێمڕۆژە ڕۆژی شەهادات و دیپلۆمایە. ئێستە ئەگەر من شتێک بنووسم سەر ناگرێت، ئینسان جاران نەختێ لە قوتابخانەی لاکۆلان دەیخوێند پێ دەگەیشت. بەلام ئێستە ئەوە نەماوە. تۆ تەماشای ئێمە دەکەی وا دەزانی ئێمە لە پڕێ بووین بەکوڕێ، ئینجا ڕووی کردە هاوڕێکانی و فەرمووی. ئا شەهادەتنامەکانتان دەربێنن. هەر کەسە دەسی کرد بەباخەڵیدا و شەهادەی دەرهێنا کە ڕوانیم یەکێک شەهادەتی جامعە، یەکێک شەهادەتی محامی،

یەکێک شەهادەی دوکتۆری، یەکێک شەهادەتی دوکتۆرا، یەکێک شەهادەتی پرۆفسۆری... هتد پێیە، ئیتر بەجارێ حەپەسام، وتی: چاوت پێ کەوت؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئێمە کە پیاوچاکین و پیاوچاکیش ئیشەکەی دنیایی نییە، کاتێ کە هەڵیان بژاردین بۆ ئەم کاروبارە، هەتا شەهادەتی عالی و تەقریری تبی و شەهادەتی حوسنی سلووک و گەلێ شتی ترمان پێ نەبێ، لێرەشدا دانامەزرێین، دنیا نموونەی قیامەتە ئەم فەرمانە وەکو بۆ ئێرە هەیە بۆ دنیاش هەر وایە، چونکە لێرەوە دنیا تێ دەگەینرێت، جا کە وابوو تۆ بەتەمای (توظیف) مەبە و بزانە نەختێ پارە پەیا بکە لای یەکێک یا کۆی بکەرەوە و دەس بکە بەکاسبی، ئەوسا ئێمە بەڵێنت پێ دەدەین بەئاشکرا خۆمان ئەم و ئەوت بۆ هان دەدەین و بێن شتت لێ بکڕن و کڕیارت بۆ زۆر دەکەین، وتم: قوربان فەرمایشتەکەت جوانە و، دەزانم کاسب خۆشەویستی خوایە، بەڵام تاقەتی کاسبیم نییە، و لەم ئیشە زیاتر نازانم، لەسەر ئیشی خۆم دەمێنمەوە، قیرۆسیا با مووچەکەم زیاد نەکرێ، قیرۆسیا با کە پیربووم تەقاویتم نەدەنێ، فەرمووی: (فایق) تۆ لەو پیاوانە نیت کە ڕێت بکەوێتە ئێرە، بەڵام دایکت خوا لێی خۆش بێ ئەوەتی مردووە گیانی هەموو ڕۆژی هەینووان لە بارەگای یەزدانا دەس دەکا بەپاڕانەوە و دەڵێ خوایە کوڕەکەم لات و بێ پول نەکەی، خوایە کوڕەکەم بکەی بەپیاوێک لات و هەژار و بێ دەسەڵات نانی بخوا، خوایە کوڕەکەم بکەی بەپیاوێک هەموو کەسێ خۆزگە بەکردەوە و ڕەوشتی بخوازن، و هەرساتە نەساتێ لەپڕ خۆی دەکا بەخانووی من و هاورێکانمدا و شانمان ماچ دەکا و دەڵێت: توخوا چاودێریی فایق بکەن، توخوا دوعای بۆ بکەن ببێ بەمەئموور (مأمور) ئێمەش وە نەبێ لەبەر خۆشەویستیە تۆ و نوێژ و ڕۆژوو تۆمان بانگ کردبێ تەنانەت لەبەر ئەو هەموو تەشەبوسە و ئەو هەموو کرووزانەوەیەی گیانی ئەو دایکە پیرەتە کە بۆت دەکا، و دەمانەوێ زۆر زۆر یارمەتیت بدەین، ئێستەش وەرە ڕۆڵەی چاک بە، گوێمان لێ بگرە سێ ئیشت بۆ دادەنێین (لەپاڵ ئەم ئیشەی کە ئێستا هەتە) یەکێکیان بکە ئیتر نانت دەکەوێتە ڕۆنەوە، وتم: فەرموو، وتی: یەکەم دەس بکە بەدوعا نووسین و کتێب گرتنەوە ئێمە پەیمانت لەگەڵا دەکەین دوعا بۆ هەرچی شتێ بنووسی گیرابێ و کتێب بۆ هەرچی شتێ بگریتەوە ڕاست دەرچێ، تۆش بۆ خۆت سەرقەڵەمانەیەکی باشیان

لێ بسێنە، بەوە پارەی باشت چنگ دەکەوێ، وتم: گەورەم ئەوە هیچ بەمن ناکرێت دەسی پڕوپیرێژن ببڕم بۆ ئەوەی شتێکم چنک بکەوێ و دڵم نایێنێت دوعا بنووسمەوە پولێک سەرقەڵەمانە بسێنم و تاقەتی ئەوەشم نییە لە شانەمەڕ و ئێسقانی گا و پێستی پشیلە شت بنووسم، بێجگە لەوانە سەریشم ببڕن کتێب ناگرمەوە بۆ ئەوەی پارەم لێی دەس بکەوێ، فەرمووی دووەم: ئێمە دوعایەک بەسەرتا دەخوێنین کە لەبەر دڵ و چاوی هەموو کەسێک خۆشەویست بی، تۆش بچۆ هاتوچۆی هەموو کەس بکە و ڕوو بکەرە ماڵە حاجی و دیوەخانی ئاغا و بەگ، بەلام لە ناوەندی قسەدا ئەوەندە دەمت هەڵبێنەوە، بڵێ جەنابی حاجی برنجی ئەمساڵمان لەسەرتۆ، یاخو جەنابی ئاغا گەنمی ساڵیمان بۆ دابنێ، یا جەنابی بەگ لە وارداتی ئەمسالا چاوێکتان لێمان بێت، ئەوسا دەبی بەلۆرت، وتم: قوربان ئەو شت خواستن و خوازەلۆکییە بۆ من دەس نادا، ئەگەر هەزارەها لیرەشم لێ چنگ بکەوێ و لە ڕووم هەڵنایەتەوە ئەو ئیشە بگرمە ئەستۆی خۆم، وتی: سێیەم – ئێمە دەتوانین هەموو شەوی دووشەمموانی لە پەردەی غەیبەوە کائنات نیشان بدەین و چاوت بەهەست و نەستی هەموو کەسێک بکەوێ، تۆش ئەوانەی کە دیوتە لە کردەوە و قسەی دراوسێ و ناسیاو و هاوڕێ لەو شەوەدا بەیانی بچۆ بڵێ شتێکم بیستووە تا ئەوەندە پارەم نەدەنێ پێتان نالێم، کە شتێکت لێ سەندن ئەوسا بەناوی خەوەوە یاخود بەناوی بیستنەوە بۆیان بگێڕەوە ئەوسا پارەت زۆر دەبێ و ماڵێک پێکەوە دەنێیت وەکو گەلێ کەس کە دەیانناسی.

وتم: گەورەم ئەم پەردەی غەیبە باسی دەفەرمووی چییە؟ جاری نشانم بدە ئەوسا وەلامتان دەدەمەوە. فەرمووی هەستە، هەستام پەلی گرتم و هەموو شوێنمان کەوتن و ڕوومان کردە خێوەتەکە کە چووینە ژوورێ، تەماشا دەکەم پەردەیەکی سپی بەرامبەری ڕۆژئاوا هەڵواسراوە لە پانی و درێژی چوار گەز ئەبێ لەسەرەوە تا خوار دیاربوو بەهەموو زمانێک نووسرابوو (ئەمە پەردەی غەیبە) فەرمووی چاوت لەم پەردەیەیە؟ وتم: بەڵێ، ئینجا بەناوی خواوە پەردەکەی لادا (خوایە گەورەیی بۆ تۆ دەشێ) کە تەماشا دەکەم چاوم لە هەموو ئاسیا، ئەوروپا، ئەمریکا، ئوسترالیا و زەریاکان هەمووی هەیە جگە لەوەش کە چاوم لێ بوو گوێشم سووک بووبوو، لە کۆلانەکانی لەندەنا دووکەس قسەیان دەکرد گوێم لێ بوو، دڵیشم هۆشێکی وای پەی

کردبوو، هەرچەندە لە قسەکانیان باش تێ نەدەگەیشم بەدڵ لە نیازەکانیان ئەگەیشم و دەمزانی قسە لە چی دەکەن، چاوم لێ بوو لە ئەمریکا فابریقەکان چی دروست دەکەن، چاوم لێ بوو، لە دەریاکاندا کەشتییەکان چییان پێیە و ڕووەو کوێ دەچن، چاوم لێ بوو لە چ ماڵێکدا کۆڕ بەستراوە، چاوم لێ بوو لە چ وڵاتێکدا ئەستێرەی بەختیاری دەدرەوشێتەوە، وە لە چ وڵاتێکدا پەپووی نەگبەتی دەخوێنێ، کە تەماشای گۆڕستانەکانیشم کرد بەهەشتی و دۆزەخیم لێک جوێ دەکردەوە، ئیتر لەناو کۆشک و قوخ و خانوودا هەرچی دانیشتن و نووستن چاوم لێ بوو و کە گوێم لێ دەگرتن دەمزانی باسی چی دەکەن، ورێنەی چی دێت بەدەمیاندا، بەتایبەتی سەیری زۆر جێم کردووە لە زۆر ماڵ وردبوومەوە، بەڵام ئەوەی زۆر لام سەیر بوو ئەمانە بوون.

١- لە چینا، کوڕێکی هەرزەکار کچێکیان بۆ کردبووە پەردەوە، کوڕەکە هەرچەندە لە دەرگای دا بووکێ لێی نەکردەوە، کوڕەکە هاتە زوبان وتی: چوار ئەنگوستیلەی سەر بەگەوهەرت بۆ دەکەم، هەر لێی نەکردەوە دووەم جار وتی: دوو کۆشک و ئوتێلت پێشکەش دەکەم، هەر لێی نەکردەوە، سێیەم جار وتی: شەش کارەکەر و حەوت نۆکەرت بۆ ڕادەگرم لەگەڵ ئەوانەی پێشوودا هەر لێم بکەرەوە کەچی هەر لێی نەکردەوە، ئینجا کوڕە وتی: تکا دەکەم پێم بڵێ بۆچی لێم ناکەیتەوە؟ چیت دەوێ بۆت پەیدا بکەم، چ فەرمایشتت هەیە سەرم لەڕێدایە، ئینجا کچەکە بەگریانەوە بەدەنگی بەرز وتی: لەم شەوەدا کە ژاپۆنییەکان خۆیان دەکوتن بۆ خاکی نیشتمانەکەت، لەم شەوەدا کە دوشمنی وڵاتەکەت پێ بەجەرگت دەنێن، لەم شەوەدا کە خاکی پیرۆزی چین لەژێر تانک و تۆپ و بۆمبای ژاپۆنییەکاندا دەناڵێنی، لەم شەوەدا کە دوشمن خەریکە جەرگمان ببڕێت، تۆ ئارەزووی یاری کردنت هەستاوە، تۆ ئەگەر لەو گەنجانە بی لەم شەوی تەنگوچەلەمەیەدا نیشتمانەکەت لەبیر چووبێتەوە تۆ بەکەڵکی من نایەیت. وا من لێرە دانیشتووم و ڕاناکەم برۆ بۆ ڕیزی (دیوان) برۆ بۆ خوێن ڕشتنی دوژمن، برۆ فریای وڵاتەکەت بکەوە و لە دەسی بێگانە دەری بێنە، ئەوسا وەرەوە لای من، ئیتر کوڕەکە دایە هارەی گریان و ڕای کرد، ئاگام لێ بوو هەر بەو شەوە سواری ئۆتۆمۆبیل بوو چوو بۆ مەیدانی جەنگ.

- له ئێران چاوم لێ بوو دوو کەس لە ژوورێکدا دانیشتبوون، یەکەم وتی: خوایە دنیا بکەی بەبۆڵشەویک. دووەم وتی: بۆچی. یەکەم وتی: چونکە لە بۆڵشەویکدا گەورە و بچووک نییە، هەموو وەکو یەک دەخۆن دەپۆشن، ژنان سەربەستن، هەژار و بێ دەسەلات نییە ئیتر بەڕاستی دینێکی بێ وێنەیە، دووەم وتی: ئەی خوا عەقڵ بەئەولادت بدا، ئەی ئاینەکەی خۆمان خراپیی چییە، چونکە ئەوەی تۆ دەتەوێ لە ڕێی چاکە و دەسگرتن و برایەتی و دۆستایەتی و...، و... خوا هەمووی لە ئاینی ئیسلامدا داناون. بەلام ئەوەتا خەڵکی ولاتەکە گوێی نادەنێ و بەجێی ناهێنن، وایان لێ هاتووە ئەگەر پێیان بڵێن بۆ پەیرەوی ئاینەکەتان ناکەن، دەڵێن ئەم دینە هەر باسی سەرفترە و زەکات و حەج و نوێژە، قورئان چییە؟ خۆ ئەگەر پێیان بڵێن باشە وا باوەڕتان بەقورئان و فەرموودەی ڕەوانەکراوی خوا نییە دەڵێن ئێمە تێگەیشتوو و پێگەیشتووین بەقانوونی ئینسانییەت و جوانی بەشەریەت بۆ یارمەتیی هەژار و بێ دەسەلات نادەن و ڕووگرژ دەکەن و پولێکیان لە دەس نابێتەوە، دەڵێن ئێمە ئەهلی ئیحسان نین، ئێمە زەکاتمان لەسەر واجب نییە و هەر خەریکی پارە پێکەوە نانن، مەسئەلەی ئەمانە وەکو وشترمرغ وایە کە پێیان وت بارهەڵبگرە وتی: من پەلەوەرم، کە پێیان وت بفڕە وتی: من وشترم، بەڵێ دەزانم لە ولاتەکەماندا تاق و تۆق پیاوی جوانمەرد هەیە، بەلام بەگوڵێک بەهار نایەت ئەوە حاڵی ولاتەکەمانە ئەی برا، ئیتر بۆچ هاواری نەزاندراو دەکەی (یاخود حەز بە ئاغایەکی نوێ دەکەی) و چۆن تۆ دڵت ڕێ دەدا کە من و تۆ فەرقمان نەبێ لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەندی تێگەیشتووی خانەدانا، بەڕاستی ئەی برادەر ئەم ئاواتی بۆ نەزاندراویەت زۆرتر ئاواتی پیاوی لات و برسییە و من وای لێ دەزانم، ئیتر تۆ هەر ئاخ هەڵکێشە.

- لە گۆرستانێکدا چاوم لێ بوو گەنجێک لە گۆڕێکدا ڕاکشابوو، شەش فریشتە بەخوار و ژووریا دەهاتن و خزمەتیان دەکرد کە وردبوومەوە سەیر دەکەم کفنەکەی خوێناوییە، تێ گەیشتم کە ئەمە بێ تاوان کوژراوە و شەهیدە لە ناکاو دەیانبرد بۆ ئاسمان و لە غەیبەوە بانگیان دەکرد ئەی فلان کوڕی فلان چیت دەوێ لە ئێمە لە باتی ئەوەی بێ تاوان کوژراوی تا پێشکەشت بکەین، کەچی

ڕووی دەکردە بارەگای یەزدان و دەیوت: ئەی یەزدانی پاک، بەگەورەیی و تاک و تەنیایی تۆ سوێند دەخۆم وەکو هاوڕێکانم نیم کە بەباخچەی جوان و حۆریی ئاڵووالا و کۆشک و ڕووباری بەهەشت دڵخۆش بم، بەحەقی ئەم کفنە خوێناوییەم کە لە بارەگای تۆدا زۆر پیرۆزە، دەبێ لەم گۆڕەوە چاوم لێ بێ کە (وڵاتەکەم بەختیار و سەربەخۆ بووبێ) ئەوسا داوای شتی ترت لێ ئەکەم، دەیانهێنایەوە ناو گۆڕەکە، لەپاش نەختێ بانگیان دەکردەوە هەروەکو جاران وەڵامی دەدایەوە هەتا چوار جار سەیرم کرد ئینجا کەوتمە تەماشای جێی تر، ئیتر لە پەردەی غەیبدا بێجگە لەوانەش لە سلێمانی و هەولێر و سنە و سابلاغ و وان گەلێ شتم دی و هەمووی یەک یەک لەبیرمە و دەزانم چین؟ بەڵام لەو دەمەدا گەورەیی پیاوچاکەکان پەردەی خستەوە جێی خۆی و ئەو دیمەنانەم لەبەرچاو گوم بوو و ڕووی تێ کردم، وتی: ها ئینجا دەڵێی چی، وتم: قوربان زۆر جوانە و هەمووی ڕاستە و وەکو تۆ دەفەرمووی بۆ ژیان پارە پەیاکەرێکی بێ وێنەیە، بەڵام من لام شوورەییە ئەو شتانەی کە چاوم پێ کەوت لە نهێنی ئەم و ئەو لەم پەردە پیرۆزەدا بچم ئاشکرای بکەم. دووەم بەناوی خەوەوە بیگێڕمەوە ئەمە خەو نییە و ئاشکرایە لام وایە دەبێتە درۆ، سێیەم بەڵکو من وتم: فلان خەوم دیوە و فلان شتم بیستووە، یاخو وا بوو وا کراوە، ئەوان لە شەرمی خۆیان پێیان لێ نا ئەوسا من تەریق دەبمەوە، سەرەڕای ئەوانەش کە وتم، خەڵق پێم دەڵێن بووە بەجووکی و جنۆکەی هەیە و ئەمەش ناوێکی سووکە، ئیتر دەستی گرتم و هاتینەوە دانیشتین و وتی ئێستا بڵێم چی خۆت شتێک بڵێ وتم: گەورەم بنووسن (مامناوەندی) زۆریان پێ خۆش بوو، دەسبەجێ نووسییان و هەموو مۆریان کرد و پێشکەشی فریشتەی ڕۆژیان کرد ئیتر هەردوو فریشتەکە بەیەکەوە چوونەوە بۆ ئاسمان، لەو وەختەدا یەکێک لە پیاوچاکەکان وتی: (ئەها کەڵەشێری عەرش قوقاندی) پیاوچاکێک هەستا و ڕووی تێ کردم وتی: ئەگەر ئەمانەی ئەمشەو دیوتە لای ئەم و ئەو ڕاستی بڵێیت و بیگێڕیتەوە جارێکی تر بانگت ناکەین بۆ لای خۆمان، بەڵام ئەگەر ناومان نەبەیت و باسمان نەکەیت زۆر جاری تر بانگت دەکەین، ئەوانی تریش هەستانە سەرپێ و گەلێک لە خوا پاڕانەوە، لەو وەختەدا فریشتەکان

خێوەتیان پێچایەوە و کورسی و مێز و چرایان کۆکردەوە و بردیان، مام ورچ بەردی فڕێ دا و ڕۆی، یاساوڵی تازە هات بۆ ئاگاداری ئەهرەمەن، پیاوچاکەکان ڕۆیشتن منیش لەگەڵ هاوڕێکەمدا لە گفتوگۆی هاتنەوەدا بووین، کەچی لە ناکاو گوێم لە شەقەیەکی قایم بوو، ڕاچڵەکیم و وریا بوومەوە کە دەڕوانم تەوژمی با پەنجەرەی ژوورەکەمی خستووەتە سەرپشت و من هەر لە شوێنی خۆمم، گورج چووم پەنجەرەکەم داخستەوە، ئینجا تێ گەیشتم کە ئەمە دەریای خەیاڵات بوو تێی کەوتبووم، سەفەرەکەشم خەیاڵی بوو، ئەگینا من لە کوێ و چاوپێکەوتنی حەزرەتی خدر و پیاوچاک و چوونە لووتکەی ئەڤەرست لە کوێ؟.

لە گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە)وە وەرگیراوە لە ژمارەکانی ١ تا ٧ ساڵی سێیەم ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥دا بڵاوکراوەتەوە.

---

(١) هایل هایل: بەئەڵمانی یەعنی بژی.

## بۆ ئیدارەخانەی ژیان تەقدیم

لە مەسایلی ئەخلاق و ئیجتیماعیاتدا، لە پاش ئایەت و حەدیس، دەتوانم بڵێم، ئەقوالی حوکەما و ئودەبا، لازمە بکرێ بەدەستوورلعەمەل، هەموو کەس ئیتاعەی بکا، ئێمە ئەقوامی شەرق هەروەکو دەستی چەپمان گۆج کردووە هەموو ئیشێکمان بەدەستی ڕاستە، لە جیسمی بەشەردا، عوزوێکی لەتیفی ژنمان لە ئەکسەری حقووق، مەحرووممان کردوون، با وجوود خەتابی ئیلاهی و ئەوامر و حەدیس ڕووناکاتە پیاوان بۆ عیلم و عەمەل سەعی و تاعەت و سائرە، هەردوولا موکەلەفن، کەچی لە مەیدانی موبارەزەدا، تەنیا پیاو وجوودی بووەتە نیشانەی تیری بەلا و موحیبەت. ئەم مەوزووعە، ئەگەرچی بەچەند جەلد تەواو نابێ، ئەمما لە تەریق فەیلەسووفی عێراق زەهاوییەوە، بەشیعرێکی عەرەبی خزمەتی ژنیشی بۆ وەتەن چەند لازمە، وەهای بەیان فەرمووە. وەکو نەخشی

بەرد لە هەموو دڵێکدا جێگیرە. ئەو شیعرە جوانە ئەمتوانی بەعەرەبی تەخمیسی بکەم. ناچار بە کوردی تەخمیسم کرد، هەتا ئەو قەولە حەکیمانەیە بخەمە بەرچاوی تێگەیشتووانی وڵات و بکرێ بە دەستوور و لعەمەل.

بۆ وەتەن غیرەتی ژاندار کە لە دنیا مەشهوور
ڕێگەیی هەق ئەگرێ رابیعە یا مەنسوور
خزمەتی جەننەت ئەکەن هەردوو چ غلمان یاحور
یرفع الشعب فریقان اناث و ذکور
وهل الطائر الا بجناحیه لطیر

فایق زێوەر

ژیان ژمارە ٦٧ ساڵی ٢

٢٤ی مایسی ١٩٢٧

## باخۆمان دەردی خۆمان دەرمان بکەین

فائق زێوەر

مەعلوومە هەر دەردێ بێ، ئینسان خۆی لە پێش حەکیمدا، ئازارەکەی فەرق دەکا، بەڵکە ئەکسەری حەکیم ئیستیفادە لە جەوابی نەخۆش دەکا. کوێت دێشی، کوێت نایەشێ، تەبیعەتت چی دەبا، چی نابا، لەم سوئال و جوابانە تەشخیس و تەداوی عیللەت دەکا، ئێمە ئەم قەومی کوردە، ئەم هەموو بەڵا و موسیبەت و فەلاکەتەمان بەسەردا هاتووە، هەمووی دەزانین ئەسەری جەهالەت و تەرکی دیانەتە، کەچی بۆ موعالەجەی تێ ناکۆشین، بەعمووم سەعی ناکەین، ئەم مارە کە لە ملمان ئاڵاوە بە تەدبیرێ دەفعی دەکەین.

زۆر لە منەوەران و ئەدیبان بە غەزەتە و بەخیتابەت هاوار دەکەن کە تورەقی ئێمە بەستراوە بە موعاریفەوە، مەعاریف واسیتەی ژیانی میللەتە، زۆر کەس لە مەعنای مەعاریف واتێ دەگەن، کە هەر مەکتەبی منالانە، لەبەو ئەوە، لازمم زانی، نەختێک مەعنای مەعاریف، ئاشکرای بکەم. ئیمرۆ مەملەکەتانی مەدەنی بەمەعاریف تەرەقییان کردووە، تەنیا مەکتەبی مناڵان نییە، بەڵکو تەحسیلیان بەچواردەور تەقسیم کردوو، مەکتەبی ئەوەڵی، مەکتەبی ئیبتیدایی، مەکتەبی سانەوی، مەکتەبی عالی، جگە لەمانە، مەکتەبی دارولفنوون کە هەموو مەکتەبە عالییەکان لە شوعەباتی دارولفنوون هەیانە. ئێمە لە هەموو کوردستاندا ئوسوولی خوێندنمان، قوتابخانەکان لە جێی ئیبتیداین و مزگەوتەکان دارولفنوونن. تەڵەبەی علووم لەم دارولفنوونەدا بیست ساڵ تەحسیل دەکا. خەت و ئیملای کاغەزنووسینی نییە. کاغەزێکی عەرەبی نازانێ بنووسێ کە هەر عەرەبیشی خوێندووە. مەتلووبێکی ببێ، بەزمانەکەی خۆی عاری لێ دێ بینووسێ، دەست دەکا بە لەقلەقیاتی فارسی و دەگەڕێ بۆ شیعری سەعدی یا حافیز، کاغەزەکەی پێ جوان بکا.

لەمیشیان سەرفی نەزەر، ئەو بیست ساڵەی کە عومری سەرف کردووە، هەموو

عیلمەکانی کە (صرف)، و (نحو)، (منطق)، (بیان) و کەلامە، ئالەتی علوومی دینن، کەچی مەسایلی دینییەکەش مەهارەت مەلەکەی تێدا پەیدا نەکردووە. خسووسەن، مەلاکانی دوور لە شار بەئەحادیسی مەوزووعە و بەفتوای عەقڵی، ئەساسی ئیسلامی کردووە، ئەمما قوتابخانەکان، مامۆستاکان بۆ نەفعی خۆیان بەسێ ساڵ قورئانی مەجید بەمنداڵێک تەواو دەکەن. ئەو منداڵە سمێڵی بۆردەبێ، لە سەنعەتی تر مەحرووم دەمێنێ، ئەوەندە فێر دەبێ کاغەزێکی نوقسانی فارسی بنووسێ. توخوا ئەمە مەعاریفە، ئەمە عیلمە، ئەمە فەننە، لە دەرسە فارسییەکان، کوللیاتی سەعدی و گوڵستان و بووستان و هەموو دیوانی حافیز و ئەمسالیان سەراپا مەنافیی عیلم و ئەخلاق و بەلایە بۆ تەربیەی ئەتفال، خەرافات... درۆی... وسائر لە منالییەوە قەرارگیری دڵیان دەبێ. بەناء عەلەیهە، من... عیلاجی ئەم نەوعە خوێندنانە دەکەم کە تەبدیل بکرێت و ئاسانیشە، جەمعیەتێکی خەیریە، تەشەکول بکا، جارێ لە سلێمانیدا مەکتەبێکی ئیبتیدایی بۆ منداڵان و مەدرەسەیەکی عیلمی بۆ تەلەبەی علووم بکەنەوە. بۆ مەعاریف ئەم (مەدرەسە عیلمیە) تەکلیف لە حکوومەت نەکرێ، مەگەر بەواسیتەی حکوومەتەوە جەلبی ئالات و ئەدەوات کە بۆ تەتبیقات لازم بێ و یا کتاب و سائرە بکەن، مەعاریف لە کیسەی جەمعیەتی ئەهالی دەرچێ. لەم جێگەیەدا سوئالێ واریدە، دەبێ کە گوایا ئەهالی دەتوانێ مەساریفی ئەم دەرسە عیلمیە بکێشێ؟ جواب. سلێمانی دائیما نزیک ١٥٠ تەڵەبەی عیلمی تێدایە، عەجەبا ئیدارەی ئەمانە لە تەرەف ئەهالییەوە، تەئمین نەکراوە، راتو، (دەقنە) پارەی ماست، پارەی شەکر و چایی، هەرکەسێ بە تەڵەبەی مزگەوتی خۆی چیی داوە، هەر ئەوەندە بدا، غایەتی مانگ یا ساڵ تەسلیمی سندووقی (جەمعییەتی خێریە)ی بکا. ئیحسان و زەکات و سەرفیترە، هەمووی یا قسمێکی بە جەمعییەت بدرێ، ئەو مەدرەسەیەش سنف و پروغرامیان هەیئەتی عولەما و بەعزێ لە موفەکرانی مەملەکەت تەرتیبی بکەن، مەوافیقی ئوسووڵی تازە تەحسیل بکەن، ئەوسا میللەت و مەملەکەت لەو عالمانەی لە مەدرەسەی عیلمیەدا بوون ئیسفادە دەکا، ئەساسی ئیسلامییەت و قەومییەت مەحکەم دەبێ، من ئەوەندەی لێ دەزانم، ئەمما ئەگەر قسەی لێ بکرێ، ئەو... موتالایە فیکر و رێگای چاکتر دەدۆزنەوە، حکوومەتێکی وەکو ژاپۆن لە تەرەف

حکوومەتەوە ٣ مەکتەبی ئیبتیدایی هەیە. هەزار و سەد مێقدارێکلە تەرەف ئەهالی و ١٥٠ زیاتر لە تەرەف ئەهالییەوە، مەکتەبی ئیبتیداییان هەیە، قیاسی لە ئیبتیدایی سائر (مکا بدانە) وایە، مەقسەد ئەوەیە ترقیاتی مەعاریفی ژاپۆن بە واسیتەی غیرەتی میللەتەوە کە وابێ، بام خۆمان دەردی خۆمان دەرمان بکەین.

ژیانەوە

ژمارە ٢٣ ساڵی ١

٣ نیسانی ١٩٢٥

## له پاشی ئینقلاب ئینتیخاب

بەڵێ منداڵ کە «صرف» دەخوێنن، لە پاش بابی «انفعال»، «انقطع»، «ینطع» دەست دەکەن بەباڵی «افتعال»، «اجتمع»، "یجتمع" خوا ئەم ئیجتیماعەلەم ئینتیخابە موبارەک بکات. ئەمما ئەم سوئالە واریدی خاتیری دەبێ، عەجابا ئینتیخابی مەبعووس باشیی دەبێ یاخۆ نابێ و ئەهالی تەماشای قیافەت، سەروەت و شوهرەت دەکەن یا نایکەن، کەوابێ ئەم چند کەلیماتە لازمە نەخشی گۆشی هەموومان بێ، مەسەلەتی کوردییە (بەئیشە نە ڕیشە) مەبعووس کە موقەدەراتی میللەتێ حەواڵەتی دین و ویجدانی ئەوە، دەبێ ئێمە بیدۆزینەوە. ئەگەر وەکو محەمەدی مەهدی خۆی شاردبێتەوە، بگەڕین پەیدای بکەین، دەست بدەینە پەلی، بیهێنینە دەرێ، مەعبووس دەبێ جامیع ئەم سیفەتانەی بێ، لەگەڵ عێزەت ئیستیقامەت، دیانەت، مەتانەت و وەتەن پەروەر و میللەت دۆست بێ، مەنافیعی عموومی، با جوزئی بێ، تەرجیحی بدا بەسەر مەنافعی شەخسیدا با کوللی بێ و لە ئەحواڵی تەئریجی و ئیجتماعی و سیاسی و جوغرافیی کوردستان موعارەفەی هەبێ، ئەقەلەن تەحسیلی مەکتەبی سانەویی دیبێ، مورەخەسی تورک لە مەجلیسی جەنەوادا وتی ئینتیهای عەرزی ٣٤، عاید بە مووسڵە، لە مەعنای قسەیەکی وا تێ بگا و ئەحواڵی ئیقتیسادی و مەعاریفی عێراق لە پێشدا چوون بووە، بیزانێ بەڵکو لە مەسەلەی فیکر و ڕای مەبعووسان، تەمەدونی قەدیم سەروەتی ئەلجزیرە، عیلم و مەعاریفی عەباسییان لە عێراقدا، ئەحیا بکرێتەوە، خولاسە مەسەلەێ نازکە، فیکری نازکی لازمە، ئەگەر ئەهلی ئینتیخاب نەکەین، مەسئوولیەتی مەملەکەت عائید بەخۆمانە. وە نییە هەرچی منەوەر بێ بڵێم، باشە و هەرچی لە مەجلیسا ناتیقە پەروازی دەکا، ئەهلە، (لکل مقام مقال)

یەکێ لە منەوەران ژنەکەی ژان دەیگرێ و بەکەماڵی حیجابەوە دەڵێ ئەفەندی، لازمە مامانێ بێنی، موحتاجم بەیەکێ لە لام بێ، منەوەر دەڵێ، حەیواناتی وەحشی و ئەهلی بێ مامان زک و زا دەکەن، ژن بۆچی داوای مامان دەکا، بەعەقڵی خۆی کەسی بۆ بانگ ناکا، زەعیفە بە وەزعی حەملەوە، وەفات دەکا، کەوابێ، هەرچی

ڕیشی سوور بێ، مام هەمزە نییە. منەوەران پیاوی واشیان هەیە (ماكل سوداء ثمرة) نەهرکە سەرتراشد قلندری داند.

مەملەکەتمان وێرانە، بێ شەوقە، بێ تیجارەتە، بێ زەراعەتە، بێ مەعاریفە، بۆ دەرمانی ئەم دەردە بام بەهەموومان حەکیمێکی حازق بنێرین، بۆ مەعبووس، فاعتبروا یا اولی الابصار.

ژیانەوە، ژمارە، ٢٥ ساڵی ١

٣٠ی نیسانی ١٩٢٥

## عەجایباتی حەقایقی موفەسەلە

* عـەجـایبم لـەو بەقـاڵانـە نایەت کـە بەلەدیە نـرخی رزقـێکمـان بـۆ مـەعلووم دەکـا، ئەوانیش دەیشـارنەوە، عەجـایبم لەوانە دێت بەخـیلافی نرخی بەلەدیە، بەدزییـەوە لە بەقاڵەکەی دەکڕن.

* عەجایبم لەوانە نایەت کە عەرەق دەخۆنەوە، عـەجایبم لەوانە دێت کە ڕەفیقی دەکەن و جوێن و بۆنی قەبووڵ دەکەن.

* عـەجایبم لەوانە نایەت لە چایخـانەدا کـاغـەز یاری دەکەن، لەسـەر چایی، عـەجـایبم لەوانە دێت کە دەورەیان دەگرن و چایەکانیان دەخۆنەوە.

* عەجـایبم لە مـوحتـەکر نایەت، بۆ قـازانج زەخیـرەی ئەنبار کـردووە، عەجـایبم لەوانە دێت کە نانی ساڵیان داناوە نایەڵن کولێرە و ئارد بەر فەقیر و غەریبە بکەوێ.

* عەجایبم لەوانە نایەت کە مـەسلەکێکیـان گرتووە بەری نادەن، عەجـایبم لەوانە دێت هەر ڕۆژە مەسلەکێ دەگرن.

* عـەجایبم لە کـتێبی عـەرەبی نایەت، لوغەی گـرانی تیـابێ، عەجـایبم لە عـیبـارەتێکی کوردی دێت کە کەلیمەی وای تێدابێ بەقاموس نەزانرێ.

* عـەجـایبم لە مـوعـەللیـمـانە نایەت کـە لە بەردەم مناڵاندا هـەتا ئێـوارە ڕاوەسـتن و تەقریر بکەن، عـەجـایبم لەو شـاگـردانە دێت کە گـوێی لێ ناگرن و وەقت خـەسـار دەکەن.

* عەجـایبم لەوانە نایەت کە پـارەیان هـەیە و خـەرجی دەکـەن، عەجایبم لەوانـە دێت کە پارەیان نییە و بێ لزووم قەرزدەکەن.

* عـەجـایبم لـەوانە نایەت شـتـێ مـودە (بـاو) بێ، بیکات، عـەجـایبم لەوانە دێت شـتـێ باوی نەماوە، دەیکات.

* عەجـایبم بە نەخۆشێک نایەت کـە مراجیعـەت بە حەکیم ناکـا، عەجایبم لە حەکـیمێ

دێ هەتا خەرجی ڕێ وەرنەگرێ، بەهاواری نەخۆشەکان ناکات.

* عەجایبم لە ساحێب نایەت کە قازانجێکی بێ ئەزییەتی هەیە، عەجایبم لە مشتەرییەکانی دێت کە وەقت و پارەکەشیان لێ خەسار دەکەن.

* عەجایبم لە ئەربابی مراجیعەت نایەت تەعجیزی مەئموووران دەکەن، عەجایبم لەوانە دێت کە بێ ئیشن و مەئموووران مەشغوول دەکەن.

لە شاگردانی سانەوی فایق زێوەر

ژیان ژمارە ٤٤ ساڵی ١

٢ کانوونی یەکەم ١٩٢٦

# پێڕست